# الأسئلة الوسطية على العقيدة الواسطية




دانراوی

د خالد بن ناصر بن سعيد ال حسين

وەرگێرانی

مصطفى محمد جفعر (گوڵپی)

# الأسئلة الوسطية

# على

# العقيدة الواسطية

نووسینی:
د. خالد بن ناصر سعيد آل حسين الغامدي

وەرگێڕانی
مصطفى محمد جعفر (گوڵپی)

# پێشەکی وەرگێڕ

ئەم نامیلکەیە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەتدا گرنگی و بایەخی خۆی هەیە، ئاگادار لێبوونیشی کەڵك و سوودی زۆری هەیە، هەر بۆیە بە ناوی خواوە دەستم کرد بە وەرگێڕانی بەسوود وەرگرتن لە ڕاڤەکانی زانایانی بەڕێز: (شیخ محمد بن صالح العثیمین) و (محمد خلیل هراس) و (صالح بن فوزان آل فوزان) و (محمد بن ابراهیم آل شیخ) و (عبدالعزیز بن محمد آل سلیمان).

وەپێویست بوو بۆ ئایەتەکان و فەرموودەکان ڕاڤەیەکی کورت یاخود تەرجەمەیەکی کورت بکەم، وە پێویست بوو ڕاڤە بۆ هەندێك زاراوە بکەم، چونکە تێگەیشتنیان بەبێ ڕاڤەکردن زەحمەت بوو یاخود گران بوو، وە جگە لەوە، پێویست بوو پێگە و مەکانەتی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە نێوان گروپەکانی دیکەدا ڕوون بکەمەوە، چونکە شیخ الإسلام ڕەحمەتی خوای لێبێت هەر ئەوەندەی نووسیوە کەلەبابی سیفات و کردارەکانی خواو وەعیدو ناوەکانی ئیمان و ئایین و یاوەرانی پێغەمبەردا ﷺنێوەندگیرن لە نێوان گروپەکانی (جەهمیە) و (مشبهە) و (مرجئە) و (وەعیدیە) و (حەروریە) و (معتزلە) و. . . هتد.

وصلی الله علی نبینا محمد و علی آله و صحبه وسلم تسلیما.

وەرگێڕ
١٤٣٧ ك – ٢٠١٦ز

**پ ١: خاوەنی کتێبی (الواسطية ) کێیە؟**

و ١: ئیمام و زانای گەورە شیخ الإسلام أحمد بن عبد الحليم ناسراو بە (ابن تيميه) یە رەحمەتی خوای لێبێت.

**پ ٢: کەی و لە کوێ لە دایك بووە و کۆچی دوایی کردووە؟**

و ٢: لە (حران) ڕۆژی دووشەممە دە یاخود دوانزەی (ربيع الأول) ساڵی (٦٦١ك) لەدایك بووە و باوکی لەگەڵ خۆی و براکانی لە ساڵی (٦٦٧ك) دا گواستوویەتیەوە بۆ شاری (دیمەشق)، و لەساڵی (٧٢٨ك) دا کۆچی دوایی کردووە.

**پ ٣: گرنگترینی کتێبەکانی چین؟ و چەندن؟**

و ٣: کتێبەکانی زۆرن، گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١-منهاج السنة النبوية.

٢-درء تعارض العقل و النقل.

٣-موافقه صحيح المنقول لصريح المعقول.

٤-الرسالة التدمرية.

٥-الرسالة الواسطية.

٦-بيان تلبيس الجهمية.

٧-الصارم المسلول على شاتم الرسول.

٨-النبوات.

٩-نقض التأسيس.

١٠-اقتضاء الصراط المستقيم.

١١-الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح.

١٢-مجموعة الفتاوى.

**پ ٤: ئەو عەقیدەگەلە بنەڕەتییەی (شیخ الإسلام) قسەی لێکردووە لە کتێبی (الواسطية ) دا چییە؟**

**و ٤: بێگومان لە دیارترینی ئەو عەقیدەگەلەی (شیخ الإسلام) قسەی لێکردووە ئەوەیە لە خوارەوە دێت:**

**١- گروپی ڕزگاربووی یارمەتیدراو و بنەماکانی ئایین لە لایان.**

**٢- باوەڕبوون بەوەی خودا وەسفی خۆی پێکردووە لە کتێبەکەیدا و بەوەشی پێغەمبەرەکەی ﷺ وەسفی پێکردووە لە فەرمودەکانیدا.[1]**

**٣- پێگەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەنێوان گروپەکانی ئومەتی ئیسلامی دا.**

**٤- باوەڕبوون بەوەی لە گۆڕدا ئەبێت و ئەگوزەرێت.**

**٥- قیامەت و زیندووکردنەوەی مردووەکان و گۆڕەپان و (عەرەصات) ی حەشر.**

**٦- شەفاعەت و جۆرەکانی لە ئاخیرەتدا.**

**٧- باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە قەدەردا.**

**٨- هەقیقەتی ئیمان و باوەڕ لەلای ئەهلی سوننەت و جەماعەت.**

**٩- باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەیاوەرانی پێغەمبەردا ﷺ.**

**١٠- باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە کەراماتی ئەولیادا.**

**١١- ڕێگەو ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەمەڕ دەقگەلی شەرعی و یاوەران و پێشینی چاك (سەلەفی سالّح).**

**١٢- باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگریکردن لە خراپە.**

**١٣- بەرپاکردنی حەج و جیهاد و نوێژی هەینی و جەژنەکان.**

**١٤- ڕەوشتگەلی بەرز و بەڕێز.**

---

**(١)** مەبەستی وەسف کردنیەتی بە سیفاتی زاتی و فیعلی لەسەر ئەوەی شایەنی کەماڵ و شکۆی بێت. وەرگێڕ.

# ئیسپاتی سیفات بۆ خودا لە قورئاندا

**پ ٥: هەقیقەتی ئەو کتێبەی شیخ الإسلام ابن تیمیە دایناوە و ناوی لێناوە (الواسطیة ) چیە؟**

**و ٥:** باوەڕی گروپی ڕزگاربووی یارمەتیدراوە، شیخ الإسلام فەرمویەتی: الحمد لله الذی أرسل رسوله بالهدی و دین الحق لیظهره علی الدین کله و کفی بالله شهیدا. و أشهد أن لا اله الا الله وحده لاشریك له إقرارا به توحیدا، و أشهد أن محمدا عبده ورسوله صلی الله علیه و علی آ له و صحبه و سلم تسلیما مزیدا.

أما بعد: فهذا اعتقاد الفرقة الناجیة المنصورة إلی قیام الساعة.

واتە: ئەمە باوەڕی گرووپی رزگاربووی یارمەتیدراوە هەتا هەستانی ساتی زیندوو بوونەوە.

**پ ٦: زانیت کە شێخ ئەم کتێبەی لە باوەڕی گروپی رزگاربووی یارمەتیدراودا نووسیوە، ئایا ئەو گرووپە کێیە؟**

و ٦: ئەوگرووپە ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

**پ ٧: هەقیقەت و ڕاستی باوەڕی گروپی ڕزگاربووی یارمەتیدراو و بنەماکانی ئایین لەلای ئەو گروپە چیە؟**

**و ٧:** باوەڕبوونە بە (الله) و فریشتەکانی و کتێبەکانی و نێردراوەکانی و زیندووکردنەوە لە دوای مردن و باوەڕبوونە بە قەدەر، خێرو شەڕ لەوەوە.

**پ ٨:** ئایا باوەڕبوون بەوەی خودا وەصفی خۆی پێکردووە لە کتێبەکەیدا و ئەوەشی پێغەمبەرەکەی وەصفی پێکردووە لە فەرمودەکانیدا لەباوەڕبوون نیە بە خودا؟

و **٨**: بەڵێ، باوەڕ بەوەی خودا وەصفی خۆی پێکردووە لە کتێبەکەیدا و بەوەی پێغەمبەرەکەی ﷺ وەصفی پێکردووە لە فەرمودەکانیدا بەبێ

**(تحريف)[١] و (تعطيل)[٢] و (تكييف)[٣] و (تمثيل)[٤] له باوه‌ڕبوونه به خودا.**

**هه‌قیقه‌تی سیفاتی خودا وه‌ك هه‌قیقه‌تی سیفاتی دروستكراوه‌كان نیه، هه‌ر وه‌ك هه‌قیقه‌تی زاتی خودا وه‌ك هه‌قیقه‌تی زاتی دروستكراوه‌كان نیه. كه‌وابوو ئه‌هلی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت باوه‌ڕیان به‌زات و سیفاتی خودا**

---

(١)(تحريف): گۆڕینی مانا یاخود له‌فزی سیفه‌تێكه له سیفاتی خودا و لادانیه‌تی له‌مه‌به‌ستی خودا و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ، جا ئه‌هلی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت ئیمان و باوه‌ڕیان به‌وه‌ی خودا وه‌سفی خۆی پێكردووه خاڵی یه له ته‌حریف، یانی گۆڕینی لفظ یاخود مانا له‌بابی سیفاتدا.

ئاگاداربه: هه‌ندێك گۆڕینی مانا و واتایان ناو ناوه (ته‌ئویل)، وه بۆ خۆشیان ناو ناوه ئه‌هلی ته‌ئویل، به‌لاّم ئه‌وه له‌ڕاستیدا هه‌ر (تحريف) ه، چونكه هیچ به‌ڵگه‌یه‌كی دروستی له‌سه‌ر نیه، هه‌ر بۆیه شێخ به (تحريف) ته‌عبیری لێكردووه. كه‌وا بوو به‌بێ ته‌حریف، واته: به‌بێ گۆڕینی مانا یاخود له‌فزی سیفه‌تێك له‌سیفاتی خودا بۆ مانایه‌كی دیكه به‌بێ به‌ڵگه‌یه‌كی دروست و راست كه ئه‌و مانایه مه‌به‌ستی خودا و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی نه‌بێ.

(٢) (تعطيل): خاڵیكردنی ناوه‌كانی خودایه هه‌موویان یاخود هه‌ندێكیان له سیفه‌تگه‌لێكی ئه‌وتۆ خودی خۆی پێ وه‌سفكردووه، یاخود نه‌فی و ئینكاریكردنی هه‌موو یاخود هه‌ندێك ناو گه‌ل و سیفه‌تگه‌لێكی ئه‌وتۆیه كه خودا بۆ خۆی ئیسپاتی كردووه، ئه‌هلی ته‌عطیل، ئه‌وانه‌ی ته‌عطیلی ده‌قه‌كانیان كردووه، كوفر و گومڕایی ئه‌وان له كوفر و گومڕایی (أهل التشبيه) گه‌وره‌تره، وه‌ك ئه‌وه‌ی هه‌ندێك له‌سه‌له‌ف فه‌رمویه‌تی: (المعطل يعبد عدما، والمشبه يعبد صنما، و الموحد يعبد إلها واحدا فردا صمدا). ئه‌هلی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت هیچ ناوێك له‌ناوه‌كانی خودا، یاخود هیچ سیفه‌تێك له سیفاتی خودا ئینكاری ناكه‌ن، به‌ڵكو به ته‌واوی دانیان پێداده‌هێنن. كه‌وابوو به‌بێ ته‌عطیل، واته: به‌بێ ئینكاریكردنی سیفاتی خودا و نه‌فیكردنیان.

(٣) (تكييف): ئه‌وه‌یه كه چۆنیه‌تی سیفه‌ته‌كه باس بكه‌یت یاخود دیاری بكه‌یت. ئه‌هلی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت باسی چۆنیه‌تی سیفاتی خودا ناكه‌ن، به‌ڵكو زانستی چۆنیه‌تیه‌كه ده‌گێڕنه‌وه بۆ خودا. وه له‌به‌رئه‌وه هه‌ندێك له‌سه‌له‌ف وتویه‌تی: ئه‌گه‌ر جه‌همی پێتی وت: خودا داده‌به‌زێت بۆ ئاسمان، چۆن داده‌به‌زێ؟ تۆش بڵێ: بێگومان خودا هه‌واڵی پێمانداوه له‌سه‌ر زمانی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یه‌وه ﷺ داده‌به‌زێ بۆ ئاسمان، به‌لاّم هه‌واڵی پێمان نه‌داوه چۆن داده‌به‌زێ. وه ئه‌مه بنه‌مایه‌كی سوودبه‌خشه.

كه‌وا بوو به‌بێ ته‌كییف، واته: به‌بێ دیاریكردن و باسكردنی چۆنیه‌تی سیفاتی خودا. بۆیه پرسیار له سیفاتی خودا ناكرێ به (كيف) و چۆن؟ وه ناوترێ چۆنیه‌تی و كه‌یفیه‌ته‌كه‌ی ئاوهایه، به‌ڵكو ئه‌وه ده‌گێڕدرێته‌وه بۆ خودا.

(٤)(تمثيل): واته: ئیسپاتی هاووێنه بۆ خودا به چواندنی دروستكراوه‌كان له هه‌موو ڕوویه‌كه‌وه، به‌لاّم (تشبيه) پێچواندنیه‌تی به دروستكراوه‌كانه‌وه له هه‌ندێك ڕووه‌وه به‌وه‌ی بگوترێ: سیفاتی خودا وه‌ك سیفاتی دروستكراوه‌كانیه‌تی، وه‌ك ئه‌وه‌ی بگوترێ: ده‌ستی خودا وه‌ك ده‌ستی ئێمه‌یه، وه چهره (وجه) ی خودا وه‌ك چهره (وجه) ی ئێمه‌یه. جا ئه‌هلی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت هیچ سیفه‌تێكی خودا ناچوێنن به سیفاتی دروستكراوه‌كانه‌وه و ناڵێن سیفاتی خودا وه‌ك سیفاتی هیچ دروستكراوێكه له دروستكراوه‌كان. كه‌وابوو به‌بێ (تمثيل)، واته: به‌بێ چواندنی خودا و سیفاتی خودا به دروستكراوه‌كان و سیفاتی دروستكراوه‌كانه‌وه.

هەیە لەسەر مەبەستی خودا و پێغەمبەری خودا، وەك ئەوەی شایەنی کەماڵ و شکۆمەندی خودابێت.[١]

بەڵکو گروپی ڕزگاربوو باوەڕیان وایە کە خودا هاوشێوەی نیە (لیس کمثله شیئ وهو السمیع البصیر)، جائەوەی خودا وەصفی خۆی پێکردووە نەفی ناکەن، واتە: نایدەنە دواوە، وەهیچ وشەیەکیش لە شوێنی خۆی ناگۆڕن، وە لەناوەکان و ئایەتەکانی خودا لانادەن و سیفاتی خودا ناچوێنن بەسیفاتی دروستکراوەکانیەوە، چونکە خودا –سبحانه- هاوناوو هاوشێوەو هاوتای نیە.

**پ ٩: ئایا خودا قیاس دەکرێ بە دروستکراوەکانی؟**

و ٩: نەخێر قیاس ناکرێ بە دروستکراوەکانی، چونکە ئەو زاناترە بە خۆی و بە غەیری خۆی، وە ڕاستگۆترینە بە وتارو جوانترینیشە بە فەرمایشت لە دروستکراوەکانی.

**پ ١٠: پاشان شێخ چی فەرمووە دەربارەی نێردراوانی خودا؟**

و ١٠: فەرموویەتی: پاشان نێردراوەکانی خودا ڕاستگۆ و بڕواپێکراو بوون بەپێچەوانەی ئەوانەی شتانێکیان لەسەر خودا دەوت نەیاندەزانی، وەلەبەر ئەمە خودا –سبحانه- فەرموویەتی: (سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) (سورة الصافات ١٨٠-١٨٢).

**پ ١١: شێخ چی لەم ئایەتانەدا فەرمووە؟**

و ١١: شێخ فەرموویەتی: . . . . وە بێگومان خودا –سبحانه- لەوەی وەصفی خۆی پێکردووە و خۆی پێ ناوناوە جەمعی کردووە لەنێوان نەفی و ئیسپاتدا، جا لادان بۆ ئەهلی سوننەت و جەماعەت نیە لەوەی نێردراوەکان پێی هاتوون، بێگومان ئەوە ڕێگە ڕاستەکەیە، ڕێگەی ئەوانەی

(١)ئەهلی سوننە دەڵێن: إن الصفة وإن كانت منفصلة عن الموصوف إلاّ أنَّ معناها غير معنى الذات الموصوفة.

خودا چاکەی لەگەڵدا کردوون لە پێغەمبەران و ساڵحان و شەهیدان و مێردخاسان.

**پ ١٢: بەڵگە چیە لەوەی خودا تێیدا جەمعی کردووە لەنێوان نەفی و ئیسپات لەسیفاتی خۆیدا؟**

و ١٢: شیخ الإسلام فەرموویەتی: وەبەڕاستی ئەوەی خودا خودی خۆی وەسف پێکردووە لەسوورەتی (الاخلاص) دا داخڵی ئەم ڕستەیە دەبێت، واتە: ئەوەی هاوسەنگی سێیەکی قورئان دەکات لە پاداشتدا، هەروەك ئەوەی لەوجێیەدا دەفەرموێت: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ اللَّهُ الصَّمَدُ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ)، واتە: بڵێ ئەو (الله) یەکە، الله جێگەی نیازە، کەسی لێ نەبووە و لە کەسیش نەبووە و هیچ کەسیش هاوتای نیە. وە ئەوەشی وەسفی خودی خۆی پێکردووە لەگەورەترین ئایەت لە قورئاندا هەروەك ئەوەی لەو جێیەدا دە فەرموێ: (اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ)[1] (سورة البقرة: ٢٥٥). واتە: الله ئەو زاتەیە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە شایستەی پەرستن بێت، زیندووە و بە هەمووشتێك ڕادەگات، نە وەنەوز و نەخەو نایگرێ، ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەویدایە هەر بۆ ئەوە، ئەوە کێیە لەلای وی تکا بکات بەئیزنی وی نەبێ؟ دەزانێ ئەوەی پێش ئەوان بووە و ئەوەی دوای ئەوانیش ئەبێت، وە ئەوان ناتوانن بە هیچ شتێك لەزانستی ئەو بەتەواوی رابگەن مەگەر بەشتێك نەبێ خۆی ویستی لێبێت، وە زانستی ئەو ئاسمانەکان و زەوی

[1] ئەم ئایەتە ئیسپاتی کۆمەڵێك سیفەتی کردووە بۆ خودا و نەفی هەندێکی دیکەشی لێکردووە، ئەوەی سیفەتی کەماڵ بێت ئیسپاتی کردووە و ئەوەی سیفەتی (نقص) و کەم و کورتی بێت نەفی کردووە. وەرگێڕ.

داگرتووه، وه پاراستنیان ئەرکی ئەو گران ناکا، وه بڵندی مەزن هەر ئەوه.
لەبەر ئەمە ئەوەی ئەم ئایەتە لەشەودا بخوێنێ ئەوا پارێزەرێك (فریشتەیەك) لەلای خوداوە پارێزگاری دەکات و هیچ شەیتانێك نزیکی ناکەوێ هەتا بەیانی دەکاتەوه.

**پ ١٣: بەڵگە چیە لە( جمع ) و کۆکردنەوه لە نێوان ( علو ) بڵندی و ( قرب ) نزیکی و ئەزەلیەت و ئەبەدیەتی خودادا؟ باسی بکە.**

و ١٣: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (سورة الحديد: ٣). واتە: ئەوه سەرەتا و کۆتا و دیار و پەنهان، وه ئەویشە بەهەمووشتێك زانا.

**-بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی زیندوویێتی و خبرەی خودا بە تاوانەکانی بەندەکان و نەفی کردنی سیفەتی مردن؟**

-و: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ وَكَفَى بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا) (سورة الفرقان: ٥٨). واتە: ئیعتیماد لەسەر زیندوویەکی ئەو تۆ بکە نامرێ، وه بەستاییشکردنی پیاهەڵبدە، وه هەربە خۆی بەسە بەگوناهەکانی بەندەکانی ئاگاداربێت.

**-بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی زانست و حیکمەتی خودا؟**

-و: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ) (سورة يوسف: ٨٣). واتە: بێگومان ئەو زانای کاردروستە. وه فەرمایشتی: (وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ) (سورة سبأ: ١). واتە: وه ئەویشە کاردروستی ئاگادار.

**پ ١٤: بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی ئیحاتەی زانستی خودا بە هەموو دروستکراوەکانی؟ واتە: بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی بە هەموو شتێك زانستی تەواوی هەیە؟**

و ١٤: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا) (سورة سبأ: ٢) واتە: دەزانێ چی بە زەوی دا ڕۆدەچێت و چیشی لێدەردەچێت و چی لە ئاسمان

دادەبەێت و چیشی پێدا سەردەکەوێ، وە فەرمایشتی: (وَعِنْدَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ) (سورة الأنعام: ٥٩) واتە: وە کلیلەکانی غەیب لەکن ئەوە، هیچ کەسێك نایانزانێ خۆی نەبێ، وە ئەو دەزانێ چی لەوشکانی و دەریادایە، وە هیچ گەڵایەك بەرنابێتەوە مەگەر ئەو دەیزانێ، وە هیچ دانەوێڵەیەك لە تاریکیەکانی (ناخی) زەویدا و هیچ تەڕێك و هیچ وشکێکیش نیە ئیللا لە کتێبێکی ڕووندا نوسراوە. وە فەرمایشتی: (وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنْثَى وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ) (سورة فاطر: ١١) واتە: وە هیچ مێینەیەك ئاوس نابێ و نازێت ئیللا بە گوێرەی زانستی ئەونەبێ. وەفەرمایشتی: (لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا) (سورة الطلاق: ١٢) واتە: بۆ ئەوەی ئێوە بزانن کە بێگومان (الله) بەسەر هەمووشتێکدا بەتوانایە، وە بە هەمووشتێکیش زانستی تەواوی هەیە.

**-بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی ڕەزاقیەت و هێزی بتەوی خودا؟**

-و: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ) (سورة الذاريات: ٥٨) واتە: بێگومان هەر (الله) ە ڕۆزیبەخشی خاوەن هێزی پتەوە.

**پ ١٥: بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی خودا وێنەی نیە و بیسەر و بینایە؟ باسی بکە.**

و ١٥: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) (سورة الشورى: ١١) واتە: هیچ شتێك وێنەی خودا نیەو ئەو بیسندەو بینایە، وە فەرمایشتی: (إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا) (سورة النساء: ٥٨) واتە: بێگومان (الله) هەموودەمێك بیسەری بینابووە و واش دەبێ.

**پ ١٦: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی ویست و ئیرادەی خودا؟ بەڵگەی لەسەر بهێنە؟**

**و ١٦: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وَلَوْلَا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) (سورة الكهف: ٣٩) واتە: بۆچ کاتێك چوویتە ناو باخەکەتەوە نەتوت ئەمە ئەوەیە خودا ویستویەتی بۆ من، هیچ هێزێك نیە بە خوانەبێ، وە فەرمایشتی: (وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلُوا وَلَكِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ) (سورة البقرة: ٢٥٣) واتە: وە ئەگەر خودا ویستبای پێکەوە شەریان نەئەکرد، بەلاّم خودا ئەوەی بیەوێ ئەنجامی دەدا. وە فەرمایشتی: (أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهِيمَةُ الْأَنْعَامِ إِلَّا مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ) (سورةالمائدة: ١) واتە: گۆشتی حوشتر و گاو مەڕ و بزنتان لە ئاژەلاّندا بۆ حەلاّڵ کراوە، ئەوە نەبێ ئەخوێنرێتەوە بەسەرتاندا، وە ڕاوی نێچیریشتان بۆ حەلاّڵکراوە مەگەر لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدابن، بێگومان خودا هەرچی و چۆنی بوێت بە گوێرەی حیکمەت و دادپەروەری خۆی حوکم دەکات، وە فەرمایشتی: (فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ) (سورة الأنعام: ١٢٥) واتە: جا ئەوەی خوا بیەوێ بیخاتە سەر ڕێگای ڕاست ئەوا سینگی گوشاد دەکات بۆ ئیسلام، وە ئەوەی خوا بیەوێ وێڵی بکات (بەهۆی لادانی خۆیەوە)، ئەوا سینگی تەنگ دەکات وەك حاڵی ئەوەی بەئەستەم بەرەو ئاسمان سەردەکەوێ تووشی تەنگە نەفسی دەبێ، بەو شێوەیە خودا سزای ئەوانە دەدات باوەڕناهێنن.**

**پ ١٧: بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی خۆشەویستی و دۆستایەتی خوا بۆ ئەولیاو دۆستەکانی؟**

**و ١٧: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) (سورة البقره: ١٩٥) واتە: وەچاکەکاری بکەن بێگومان خودا**

چاکەکارانی خۆش دەوێت، وە فەرمایشتی: (وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) (سورة الحجرات: ٩) واتە: وە دادپەروەربن لە حوکمدانتاندا بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ، وە فەرمایشتی: (فَمَا اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ) (سورة التوبة: ٧) واتە: هەتا ئەوان (بتپەرستەکان) لەسەر پەیمانەکەیان بن بۆتان ئەوا ئێوەش بەهەمان شێوە لەسەر پەیمانەکەتان بن بۆ ئەوان، بێگومان خودا پارێزکارانی (لە ئیماندارانی وەفادار بە پەیمان) خۆش دەوێت، وە فەرمایشتی: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ) (سورة البقرة: ٢٢٢) واتە: بێگومان خودا تەوبەکارانی خۆش دەوێ، وە خاوێنکارانیشی خۆش دەوێ، وە فەرمایشتی: (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ) (سورة آل عمران: ٣١) واتە: بڵێ ئەگەر ئێوە خوداتان خۆش دەوێ، ئەوا پەیڕەوی من بکەن خوداش ئێوەی خۆش دەوێ، وە فەرمایشتی: (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) (سورة المائدة: ٥٤) واتە: ئەوا خودا لە ئایندەدا کۆمەڵێك دەهێنێت خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ، وە فەرمایشتی: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ) (سورة الصف: ٤) واتە: بێگومان خودا ئەوانەی خۆش دەوێ لە ڕێگەی ئەودا بەڕیز دەجەنگن هەردەڵێیت دیواری کۆشکێکی بە قوڕقوشم جۆشدراون، وەفەرمایشتی: (وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ) (سورة البروج: ١٤) واتە: وە ئەویشە گوناهپۆشی دلۆڤان.

**پ ١٨: بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی بەزەیی و لێبوردن؟ بەڵگەگەلێك لەسەر ئەوە بهێنە.**

و ١٨: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) (سورة الفاتحة: ١) واتە: بەناوی خودای بەبەزەیی میهرەبان، وە (سورة النمل: ٣٠)، وە فەرمایشتی: (رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَحْمَةً وَعِلْمًا) (سورة غافر: ٧) واتە: پەروەردگارمان هەمووشتێکت بە بەزەیی و زانستی خۆت

داگرتووە، وە فەرمایشتی: (ورحمتي وسعت كل شيئ) (سورة الأعراف: ١٠٧) واتە: وە بەزەیی من هەمووشتێکی داگرتووە، وە فەرمایشتی: (كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ) (سورة الأنعام: ٥٤)، واتە: پەروەردگارتان بەزەیی لەسەر خودی خۆی نووسیوە و پێویست کردووە، وە فەرمایشتی: (وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ) (سورة يونس: ١٠٧) واتە: وە ئەویشە گوناهپۆشی میهرەبان، وە فەرمایشتی: (فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ) (سورة يوسف: ٦٤) واتە: خودا باشترین پارێزەرە و هەرئەویشە لە هەموو بەبەزەییەك بەبەزەیی ترە.

**پ ١٩: بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی ڕازیبوون و توڕەبوون و خەشم و قین و کەراهیەتی خودا لەقورئاندا؟ بەڵگە گەلێك بهێنە.**

و ١٩: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ) (سورة المائدة: ١١٩) واتە: خودا لەوان ڕازی بووە و ئەوانیش لە خودا ڕازی بوون، وە فەرمایشتی: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ) (سورة النساء: ٩٣) واتە: وەئەوەی ئیماندارێك بە ئەنقەست بکوژێت ئەوە سزاکەی دۆزەخە بە هەتاهەتایی تێیدا دەبێت، وە خودا غەزەبی لێگرتووە و لە بەزەیی خۆشی دووری خستووەتەوە، وە فەرمایشتی: (ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ) (سورة محمد: ٢٨) واتە: ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بووە کە ئەوان شوێنی ئەوە کەوتن ڕق و قینی خودای هەڵستاند، وە ڕقیان لە ڕازیبوونی خودا بوو جا بەو هۆیەوە کردەوەکانی پووچ کردنەوە، وە فەرمایشتی: (فَلَمَّا آسَفُونَا انْتَقَمْنَا مِنْهُمْ) (سورة الزخروف: ٥٥) واتە: جا کاتێك ڕقیان هەڵساندین جەزرەبەمان دان، وە فەرمایشتی: (وَلَكِنْ كَرِهَ اللَّهُ انْبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ) (سورة التوبة: ٤٦) واتە: بەڵام خودا ڕقی لە دەرچوونیان

بوو (بۆ جیهاد) بەهۆی ئەوەوە تەمبەڵی کردن، وە فەرمایشتی: (كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ) (سورة الصف: ٣) واتە: بە ڕقبوونەوە گەورەیە لەکن خوا ئەوەی کە بەزمانتان دەیڵێن بە کردار ئەنجامی نادەن.

**پ ٢٠: بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی هاتن (مجیئ) و (إتیان)، بۆ خودا علی مایلیق بە تعالی؟**

و ٢٠: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ) (سورة البقرة: ٢١٠) ، وە فەرمایشتی: (هل ينظرون الا أن تأتيهم الملائكة او يأتي ربك او يأتي بعض آيت ربك) (سورة الأنعام: ١٥٨) واتە: چاوەڕوانی هیچ شتێکی تر ناکەن ئەوە نەبێ کە فریشتەکان بێن، یاخود خواوەندت بێت، یاخود هەندێك لە نیشانەکانی خواوەندت بێن. وە فەرمایشتی: (كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا) (سورة الفجر: ٢١-٢٢) واتە: نا ناشێت حاڵتان هەرئاوابێ، کاتێ زەوی هەپروون هەپروون بوو، وە پەروەردگاریشت (ئەی پێغەمبەر) هات (بە هاتنێك شایەنی خۆی بێت)، وە فریشتەکانیش بە ڕیز ڕیز هاتن، وە فەرمایشتی: (وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاءُ بِالْغَمَامِ وَنُزِّلَ الْمَلَائِكَةُ تَنْزِيلًا) (سورة الفرقان: ٢٥) واتە: باسی ئەو ڕۆژە بکە ئاسمان بە هەور شەقار شەقار ئەبێ ، وە فریشتەکانیش دادەبەزێنرێن بە دابەزین.

**پ ٢١: بەڵگە چییە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی (الوجە) بۆ خودا علی ما یلیق بە تعالی؟ باسی بکە.**

و ٢١: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ) (سورة الرحمن: ٢٧) وەلەم ئایەتەشدا خودا جل جلالە ئیسپاتی (وجە) ی بۆ زاتی خۆی کردووە، وە ئێمەش باوەڕمان پێی هەیە لەسەر مەبەستی خۆی، وە فەرمایشتی: (كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ) (سورة القصص: ٨٨).

**پ ٢٢: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی دەست بۆ خودای باڵا لەسەر ئەوەی شایەنی بێت؟**

و ٢٢: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (**مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ**) (سورة ص: ٧٥) واتە: چی ڕێگری کردیت لەوەی کەکرنوش بەریت بۆ ئەوەی بە دوو دەستی خۆم ئافراندم، وە فەرمایشتی: (وَقَالَتِ الْيَهُودُ يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنْفِقُ كَيْفَ يَشَاءُ) (سورة المائدة: ٦٤) واتە: وە جووەکان وتیان دەستی خودا کەلەبچەکراوە، دەستی ئەوان کەلەبچەکریَ و نەفرینیشیان لێبێت بەهۆی ئەوەی وتیان، بەڵکو دوودەستی خودا کراوەن چۆنی بویَ دەبەخشێت.

**پ ٢٣: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی چاو بۆ خودای باڵا لەسەر ئەوەی شایەنی بێت؟**

و ٢٣: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا) (سورة الطور: ٤٨) واتە: ئارام بگرە بۆ حوکمی خواوەندت چوون تۆ بەدیار چاومانەوەیت، وە فەرمایشتی: (وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِمَنْ كَانَ كُفِرَ) (سورة القمر: ١٣-١٤) واتە: وەهەڵمان گرت لەسەر کەشتیەکی تەختەدار و بزمار، دەڕۆشت بە چاودێری ئێمە بۆی، ئەوەش پاداشتێك بوو بۆ ئەوەی کوفری پێکرابوو، وە فەرمایشتی: (وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي) (سورة طه: ٣٩) واتە: وەخۆشەویستیەکیشم خستەسەرت لەلای خۆمەوە (بۆ ئەوەی خۆشەویست بیت لە ناو خەڵکدا)، وە بۆ ئەوەی لەپێش چاوی خۆم و بەچاودێری خۆم پەروەردە بیت.

**پ ٢٤: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی بیستن و بینین بۆ خودا لەسەر ئەوەی شایەنی بێت؟**

و ٢٤: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ) (سورة المجادلة: ١) واتە: هەر بەڕاستی خودا قسەی ئەو ژنەی بیست دەربارەی مێردەکەی لەگەڵ تۆ دەمقاڵی دەکرد و سکاڵای خۆی بۆلای خودا دەبرد، وە خودا دەمەقاڵێیەکەتانی دەبیست، بێگومان خودا بیسەری بینایە، وە فەرمایشتی: (لَقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ) (سورة آل عمران: ١٨١) واتە: هەربەڕاستی خودا قسەی ئەوانەی بیست وتیان بێگومان خودا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین، وە فەرمایشتی: (أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ بَلَى وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ) (سورة الزخرف: ٨٠) واتە: ئایا ئەوان وادەزانن کە ئێمە نهێنی و چپەکردنیان نابیستین، بەڵێ دەیبیستین، وە نێردراوەکانیشمان (واتە: فریشتەکانیشمان) لەلایانن دەینووسن، وە فەرمایشتی: (إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى) (سورة طه: ٤٦) واتە: بێگومان ئەز لەگەڵتاندام ئەبیستم و ئەبینم، وە فەرمایشتی: (أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى) (سورة العلق: ١٤) واتە: ئایا نەی ئەزانی بەوەی کە بێگومان خودا ئەبینێ، وە فەرمایشتی: (الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) (سورة الشعراء: ٢١٨-٢٢٠) واتە: ئەوەی دەتبینێت کاتێك هەڵدەستی (بۆ نوێژ)، وە هەڵسوکەوتیشت (دەبینێت) لەناو کوڕنووشبەراندا، بێگومان هەر ئەوە بیسەری زانا، وە فەرمایشتی: (وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ) (سورة التوبة: ١٠٥) واتە: وەبڵێ کاروکردەوە بکەن، بەم زووانە کاروکردەوەکەتان خودا و پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران دەیبینن.

**پ ٢٥: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی (مکر) و (کید) بۆ خودا لەسەر ئەوەی شایانی بێت؟**

و ٢٥: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (**وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ**) (سورة الرعد: ١٣) واتە: وە ئەو (خودا) سەختگیرە. وە گوتراوە: بێگومان (المحال) بەواتای (المكر) هاتووە، شێخ ئەم واتایەی مەبەست بووە لە هێنانی ئایەتەکەدا هەرچەندە واتای یەکەم لەپێشترە، وە فەرمایشتی: (وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ) (سورة آل عمران: ٥٤) واتە: وە ئەوان فێڵی خۆیان کرد، وە خوداش بەنهێنی کاری خۆی کرد (بەوەی عیسای ڕزگارکرد و شێوەی خستەسەر ئەوەی ویستی بیکوژێت) وە خودا باشترینی کارسازانانی بەنهێنی و ژێر بەژێری یە.

وە لەوەدا ئیسپاتی سیفەتی (مکر) ی کردووە بۆ خۆی لەسەر ئەو شێوەیەی شایەنی کەماڵ و شکۆمەندی خۆی بێت. وە فەرمایشتی: (وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ) (سورة النمل: ٥٠)، وەفەرمایشتی: (إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا وَأَكِيدُ كَيْدًا) (سورة الطارق: ١٥-١٦).

وە لەم دوو ئایەتەی دیکەشدا ئیسپاتی سیفەتی(مکر) و (کید) دەکات بۆ خۆی، بەڵاْم (مەکر) و (کید) بۆ خودا لە ناوەڕۆکدا هەقە بە پێچەوانەی مەکر و فێڵ و تەڵەکەی کافران و دوژمنانی خواوە کە باتڵە.

**پ ٢٦: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی (عەفو) و لێبوردن و ڕەحمەت و عیززەت و توانایی خودا؟ بەڵگە گەلێك بێنە.**

و ٢٦: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (إِنْ تُبْدُوا خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا عَنْ سُوءٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا) (سورة النساء: ١٤٩) واتە: ئەگەر (ئێوە) چاکەیەك ئاشکرا بکەن یاخود پەنهانی بکەن یاخود لە خراپەیەك چاوبپۆشن ئەوە بێگومان خودا چاوپۆشیکاری بە توانایە، وە فەرمایشتی: (وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ

رَحِيمٌ) (سورة النور: ٢٢) واته: با ببورن و چاوپۆشی بکەن ئایا حەزدەکەن خودا لێتان خۆش بێت، وە خودا گوناهپۆشی میهرەبانە، وە فەرمایشتی: (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وللمؤمنين) (سورة المنافقون: ٨) واتە: عیزەت هەر بۆ خودا و بۆ پێغەمبەرەکەیی و بۆ ئیماندارەکانە، وە فەرمایشتی: (قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ) (سورة ص: ٨٢) واتە: وتی سوێند بەعیزەتی تۆ هەموویان لە خشتە دەبەم.

**پ ٢٧: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی ناو بۆ خودا و نەفی وێنە (مثل) لێی؟ باسی بکە.**

و ٢٧: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ ذِي الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ) (سورة الرحمن: ٧٨) واتە: فەرپیتی ناوی خواوەندی شکۆدار و رێزدارت گەلێك زۆرە، وە فەرمایشتی: (فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا) (سورة مريم: ٦٥) واتە: خودا بپەرستە و خۆڕاگربە لەسەر پەرستنی، ئایا هیچ هاوناویەك دەزانی بۆ ئەو ببێ؟، وە فەرمایشتی: (وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَد) (سورة الإخلاص: ٤) واتە: وە ئەو (خودا) هیچ کەسێك هاوتای نیە، وە فەرمایشتی: (فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ) (سورة البقرة: ٢٢) واتە: هاوشێوەگەلێك بۆ خودا دامەنێن، وە ئێوە بۆ خۆتان دەزانن (ئەو هاوشێوەی نیە)، وە فەرمایشتی: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ) (سورة البقرة: ١٦٥) واتە: وەلەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن جگە لە (الله) هاوتاگەلێك بۆ خودا دەگرن لە پەرستندا، خۆشیان دەوێن وەك خۆشویستنی خودا.

**پ ٢٨: بەڵگە چیە لەسەر نەفی شەریك لە خوای بالاّ؟ بەڵگە گەلێك بهێنە دەلالەت لەسەر ئەوە بکات.**

و ٢٨: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا)

(سورة الإسراء: ١١١) واته: وەبڵێ سوپاس هەر بۆ ئەو خوایەی ئەوتۆیە هیچ کەسێکی نەکردووە بە منداڵ بۆخۆی، وە هیچ شەریکێکی نیە لە دەسەڵاتدا، وە هیچ دۆستێکیشی نیە لە زەلیلیدا، وە بە گەورەی ڕابگرە بە گەورە راگرتن، وە فەرمایشتی: (يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (سورة التغابن: ١) واته: ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەشی لە زەویدایە سەناخوانی بۆ خودا دەکا، دەسەڵات و سوپاس هەر بۆ ئەوە، وە هەر ئەویش بەسەر هەمووشتێکدا بە توانایە، وە فەرمایشتی: (تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا) (سورة الفرقان: ١-٢) واته: فەڕو پیتی زۆرە ئەو زاتەی قورئانی دابەزاند بۆ سەر بەندەی خۆی، بۆ ئەوەی ببێ بە هۆشیاریدەر بۆ هەموو خەڵك، ئەو زاتەی دەسەڵاتی ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆئەوە و هیچ منداڵێکی نەگرتووە بە فەرزەند بۆ خۆی و هیچ شەریکێکیشی نیە لە دەسەڵاتدا، وە هەموو شتێکی دروستکردووە، جا ئەندازەشی گرتووە بە ئەندازەگرتنێکی ورد، وە فەرمایشتی: (مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ) (سورة المؤمنون: ٩١-٩٢) واته: خودا هیچ منداڵێکی نەگرتووە بە فەرزەند بۆ خۆی و هیچ پەرستراوێکیشی لەگەڵ نەبووە، دەنا هەموو پەرستراوێك بەوەی دروستی کردووە دەڕۆشت و دەیبرد، وە هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا زاڵ دەبوون، خودا بەدوورە لەوەی ئەوان وەسفیان پێدەکرد، زانای نادیار و دیارە، جا خودا گەلێك بەرزە لەوەی ئەوان ئەیکەن بەشەریك بۆی لە خوداکانیان، وە فەرمایشتی: (فَلَا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الْأَمْثَالَ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) (سورة النحل: ٧٤) واته:

نموونەگەلێك بۆ خودا مەهێننەوە (واتە: بەوەی بڵێن: خودا وەك ئەوە یاخود ئەوەیە، یاخود شەریکی بۆ پەیدا مەکەن لە پەرستندا) بێگومان خودا دەزانێ (وێنە و شەریکی نیە)، وە ئێوە (ئەی کافرینە) نازانن، وە فەرمایشتی: (قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ) (سورة الأعراف: ٣٣) واتە: بڵێ بێگومان پەروەردگارم کارگەلی ناقۆڵای قەدەغەکردووە ئەوەی دیاربێ تێیداو ئەوەی شاراوە بێ، وە تاوان و دەستدرێژی بۆسەر مافی خەڵك بە ناهەق، وە ئەوەشی دەیکەن بەشەریکی خودا، هیچ بەڵگەیەکی لەگەڵ دانەبەزاندووە، وە ئەوەشی کە لەسەر خودا دەیڵێن نایزانن. واتە: هەموو ئەوانەشی قەدەغە کردووە.

**پ ٢٩: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی (استواء) بۆ خودا لەسەر عەرش لەسەر ئەوەی شایەنی بێت؟ باسی بکە.**

و ٢٩: بەڵگە فەرمایشتی خودایە لە حەوت جێگە لە قورئانی شکۆداردا: ئەویش لەسورەتی (الأعراف) فەرمایشتی: (إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ) (سورة الأعراف: ٥٤)، وە لە سورەتی (یونس) فەرمایشتی: (إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ) (سورة يونس: ٣)، وە لە سورەتی (الرعد) فەرمایشتی: (اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ) (سورة الرعد: ٢) واتە: اللّٰه ئەو زاتەی ئەو تۆیە ئاسمانەکانی بەرز ڕاگرتووە بەبێ کۆڵەکە و ستوونگەلێك بیانبینن پاشان سەرکەوتە سەر عەرش ، وە لەسورەتی (طه) فەرمایشتی: (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى) (سورة طه: ٥) واتە: خودای رەحمان سەرکەوتە سەر عەرش، وە لە سورەتی (الفرقان) فەرمایشتیی: (ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ الرَّحْمَنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيرًا) (سورة الفرقان: ٥٩) واتە:

پاشان سەرکەوتە سەر عەرش، هەر ئەوە خودای رەحمان، دەتۆش لە رەحمان لە ئاگادارێك بپرسە هەواڵی سیفاتت پێ بدات. مەبەست بە (استواء) ئیستوایەکە شایەنی شکۆداری و کەماڵی خودا بێت بەبێ چواندن وەك سیفەتەکانی دیکەی خودا، وە لە سورەتی (السجدة) فەرمایشتیی: (اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ) (سورة السجدة: ٤)، وە لە سورەتی (الحديد) فەرمایشتیی: (هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ) (سورة الحديد: ٤).

**پ ٣٠: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی (علو) و بڵندی خودا بەسەر دروستکراوەکانیەوە؟ بەڵگە گەلێك بێنە لەسەر ئەوە.**

و ٣٠: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ) (سورة آل عمران: ٥٥) واتە: ئەی عیسا بێگومان ئەز لەزەوی وەرت دەگرم و بەرزت دەکەمەوە بۆلای خۆم، وە فەرمایشتی: (بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ) (سورة النساء: ١٥٨) واتە: بەڵکو خودا بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی. ئەمە وەڵامە بۆ جووەکان ئەوانەی ئەیانوت عیسایان کوشتووە، وە فەرمایشتی: (إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ) (سورة فاطر: ١٠) واتە: وشەگەلی پاك بۆلای ئەو بەرزئەبێتەوە، وە کردەوەی چاکیش بەرزی دەکاتەوە. واتە: وشەگەلی پاك بەرزدەکاتەوە، وە فەرمایشتی: (وقال فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ أَسْبَابَ السَّمَوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِبًا) (سورة غافر: ٣٦-٣٧) واتە: فرعەون وتی: ئەی هامان کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە بەشکم بگەمە هۆکارەکان هۆکارەکانی ئاسمانەکان، بۆ ئەوەی بەخۆم سەیری خواکەی (پەرستراوەکەی) موسا بکەم، وە بێگومان ئەز واگومان دەبەم کە موسا درۆزن بێت (لە دەعواکەیدا کە ئێمە خوایەکمان هەبێت لە سەروو ئاسمانەکانەوە بێت)، وە فەرمایشتی:

(أَأَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ أَمْ أَمِنْتُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ أَنْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ) (سورة الملك: ١٦-١٧) واتە: ئایا ئێوە (ئەی بتپەرستەکانی مەککە) ناترسن لەو زاتەی لە سەروو (علو) ە رۆتان ببات بە ناخی زەویدا و لەناکاو زەویش بە ئێوەوە گێژبخوات (هەتا تیادەچن؟)، یاخود ناترسن لەوەی لەسەرووە (واتە: لەخودا) کە بایەکی بەزیختان بنێرێتەسەر، جا ئەوسا دەزانن ئاگادارکردنەوەی من چۆنە (کاتێ کە سزاکەتان بەچاوی خۆتان دیت).

وە لەم ئایەتانەشدا ئیسپاتی سیفەتی (علو) ی تێدایە بۆ خودا بەشێوەیەك شایەنی کەماڵ و شکۆی زاتی خۆی بێت.

**پ ٣١: بەڵگە چیە لەسەر سیفەتی (مەعییەت) ی خودای بالا بۆ بەندەکانی خۆی لەسەر ئەوەی شایەنی بێت؟**

و ٣١: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) (سورة الحديد: ٤) واتە: خوا ئەو زاتەی ئەو تۆیە ئاسمانەکان و زەوی لەشەش رۆژدا دروستکرد، پاشان لەسەر عەرش جێگیربوو، دەزانێ چی رۆدەچێت بە ناخی زەویدا و چی دەردەچێت لێیەوە و چی لەئاسمان دادەبەزێ و چیشی پێدا سەردەکەوێ، وە ئەو لەگەڵتاندایە لەهەرکوێ بن، وە خودا بەوەی دەیکەن بینایە، وە فەرمایشتی: (مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (سورة المجادلة: ٧) واتە: چپە چپی هیچ سێ کەسێك نابێ ئەو چوارەمیان نەبێ، وە هی هیچ پێنج کەسێکیش نابێ ئەو شەشەمیان نەبێ، وە لەوە کەمتر و لەوە زۆرتر نابێ ئیللا ئەویان لەگەڵ

دەبێ لە هەرکوێیەك بن، پاشان لەڕۆژی قیامەت هەواڵیان پێدەدا بەوەی ئەنجامیان داوە، بێگومان خودا بەهەمووشتێك زانایە، وە فەرمایشتی: (لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا) (سورة التوبة: ٤٠) واتە: نیگەران مەبە بێگومان خودا لەگەڵماندایە، وە فەرمایشتی: (إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى) (سورة طه: ٤٦) واتە: بێگومان ئەز لەگەڵتاندام ئەبیستم و ئەبینم، وە فەرمایشتی: (إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُون) (سورة النحل: ١٢٨) واتە: بێگومان خودا لەگەڵ ئەوانەیە پارێز دەکەن و لەگەڵ ئەوانەشە چاکەکارن، وە فەرمایشتی: (وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) (سورة الأنفال: ٤٦) واتە: ئارام بگرن بێگومان خودا لەگەڵ ئارامگراندایە، وە فەرمایشتی: (كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ) (سورة البقرة: ٢٤٩) واتە: زۆر کۆمەڵی کەم زاڵ بووە بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا بەئیزنی خودا، وە خودا لەگەڵ خۆڕاگراندایە.[(١)]

**پ ٣٢: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی (کلام) بۆ خودا لەسەر ئەوەی شایەنی بێت؟ باسی بکە.**

و ٣٢: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا) (سورة النساء: ٨٧) واتە: وەکێ بەگوتە لە خوا ڕاستگۆترە؟، وە فەرمایشتی: (وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا) (سورة النساء: ١٢٢) واتە: وە کێ بە قسە لەخوا ڕاستبێژترە؟، وە فەرمایشتی: (وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ) (سورة المائدة: ١١٦) واتە: باسی ئەوکاتە بکە خوا فەرمووی ئەی عیسای کوری مەریەم. . . ، وە فەرمایشتی: (وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقًا

---

(١)سیفەتی مەعییەت دوو جۆرە:

١-مەعیەتی گشتی: ئەوەی بە واتای زانست و ئاگاداربوونی خودا هاتووە بەسەر دروستکراوەکاندا.

٢-مەعیەتی تایبەتی: واتە: ئەوەی بە واتای پاراستن و یارمەتیدان و عینایەت هاتووە، ئەویش تایبەتە بە ئەهلی ئیمان و تەقواوە.

وَعَدْلًا) (سورة الأنعام: ١١٥) واته: وەوشەی خواوەندت (واتە: قورئان) بەڕاستگۆیی و دادپەروەری تەواو بوو، وە فەرمایشتی: (وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا) (سورة النساء: ١٦٤) واته: وە خوا موسای دواند بە دواندن، وە فەرمایشتی: (مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ) (سورة البقرة: ٢٥٣) واته: لەناویاندا (لەناو نێردراوەکاندا) هەبوو خودا قسەی لەگەڵ کردبوو، وە فەرمایشتی: (وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ) (سورة الأعراف: ١٤٣) واته: وەکاتێك موسا لەکاتی دیاریکراوی ئێمەدا هات و خواوەندی قسەی لەگەڵ کرد، وە فەرمایشتی: (وَنَادَيْنَاهُ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا) (سورة مريم: ٥٢) واته: وە لەلای ڕاستی کێوی (طور)ی (سیناء) بانگمان لێکرد، وە نزیکمان کردەوە هەتا بەنهێنی دواندمان، وە فەرمایشتی: (وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) (سورة الشعراء: ١٠) واته: وە باسی ئەوکاتە بکە پەروەردگارت بانگی موسای کرد کە بڕۆ بۆلای ئەو نەتەوە ستەمکارە، وە فەرمایشتی: (وَنَادَاهُمَا رَبُّهُمَا أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَنْ تِلْكُمَا الشَّجَرَةِ) (سورة الأعراف: ٢٢) واته: وە پەروەردگاریان بانگی کردن ئایا ڕێگریمان نەکردن لە (خواردنی بەری) ئەو درەختە؟، وە فەرمایشتی: (وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ) (سورة القصص: ٦٥) واته: وە باسی ئەو ڕۆژە بکە خواوەندت بانگیان دەکات جا دەفەرموێ چیتان وەڵامی نێردراوەکان (پێغەمبەرەکان) دایەوە؟وە فەرمایشتی: (وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ) (سورة التوبة: ٦) واته: وە ئەگەر یەکێك لە هاوبەشپەرستەکان داوای پەنای لێت کرد، تۆش پەنای بدە هەتا گوێی لەفەرمایشتی خوداوە دەبێ، وە فەرمایشتی: (وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِنْ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) (سورة البقرة: ٧٥) واته: وە هەربەڕاستی گروپێکیان فەرمایشتی خوایان

دەبیست پاشان دەیانگۆڕی لەدوای ئەوەی تێیدەگەیشتن، وە خۆشیان دەیانزانی، وە فەرمایشتی: (يُرِيدُونَ أَنْ يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ قُلْ لَنْ تَتَّبِعُونَا كَذَلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِنْ قَبْلُ) (سورة الفتح: ١٥) واتە: ئەیانویست کە فەرمایشتی خوا بگۆڕن، بڵێ ئێوە هەرگیز لە شوێن ئێمە نایەن، خودا لەوەو پێش ئاوای فەرمووە، وە فەرمایشتی: (وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنْ كِتَابِ رَبِّكَ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ) (سورة الكهف: ٢٧) واتە: بخوێنە ئەوەی سروشت بۆکراوە لە کتێبی پەروەردگارت، هیچ کەسێك ناتوانێ وشەکانی بگۆڕێ، وە فەرمایشتی: (إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ) (سورة النمل: ٧٦) واتە: بێگومان ئائەم قورئانە ئەخوێنێتەوە بەسەر نەوەکانی ئیسرائیلدا زۆرترینی ئەوەی تێیدا جیاڕابوون. واتە: هەقیان بۆ باس دەکات، لەوەدا ڕاجیاییان هەبوو.

**پ ٣٣: بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی کە قورئان لە خواوە دابەزێنراوە و فەرمایشتی خواوەندمانە ئەوە؟ باسی بکە.**

و ٣٣: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وَهَذَا كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ مبارك) (سورة الأنعام: ١٥٥) واتە: وە ئائەمە (واتە: قورئان) کتێبێکی فەڕدارە دامانبەزاندووە. کتێب واتە: نوسراو، چونکە لە (لوح المحفوظ) و لە رووپەڕەکانی دەستی فریشتەکان و لە (مصاحف) ی موسڵمانانندا نوسراوە، وە فەرمایشتی: (لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ) (سورة الحشر: ٢١) واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبا بۆسەر کێویێك ئەوا ئەو کێوەت دەبینی بەملکەچی بەشەقاربوویی لەترسی خوا، وە فەرمایشتی: (وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِنْ رَبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ)

(سورة النحل: ١٠١-١٠٣) واتە: وەکاتێك ئایەتێك بخەینە جێگەی ئایەتێك (واتە: ئایەتێك بگۆڕین بە ئایەتێك)، وە خوا بۆ خۆی زاناترە بەوەی دای ئەبەزێنێ، ئەوا ئەیانوت ئەوە تۆ هەر درۆ هەڵبەستێکیت، وانیە ئەوان دەیڵێن بەڵکو زۆرترینیان نازانن. (واتە: هیچ لە زانست نازانن، یاخود حیکمەتی نەسخ نازانن) بڵێ (روح القدس، واتە: جبریل) لەلای پەروەردگارتەوە بەهەق و داد دایبەزاندووە، بۆ ئەوەی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە دامەزراویان بکات، وە ڕێنمایی و موژدەش بێت بۆ موسڵمانان، وە سوێندبێت ئەوە دەزانین ئەوان ئەڵێن ئەوە مرۆڤێکە ئەم قورئانەی فێردەکات، درۆئەکەن، بێگومان زمانی ئەوەی نیسبەتی فێرکردنی قورئانی دەدەنەپاڵ ئەعجەمی یە (زمانی عەرەبی چاك نازانێ)، وە ئەم قورئانە عەرەبیەکی ڕوونی پاراوە.

**پ ٣٤: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی بینینی ئیمانداران بۆ خواوەندیان لەڕۆژی قیامەتدا؟**

و ٣٤: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ) (سورة القيامة: ٢٢-٢٣) واتە: روخسارگەلێك لەورۆژەدا درەوشاوەن، بۆ خواوەندیان دەڕوانن، وە فەرمایشتی: (عَلَى الْأَرَائِكِ يَنْظُرُونَ) (سورة المطففين: ٢٣) واتە: لەسەر تەختەگەلێکەوە تەماشادەکەن. بێگومان تەماشاکردنەکە لەم ئایەتەیاندا گشتگیرە لە تەماشاکردنی خواو ئەوەی خواپێیانی بەخشیوە، وە فەرمایشتی: (لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ) (سورة يونس: ٢٦) واتە: بۆ ئەوانەی چاکیان کردوە بەهەشت و زیادەیەکیش هەیە. مەبەست بە (زیادە) تەماشاکردنی خودایە، وە فەرمایشتی: (لَهُمْ مَا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ) (سورة ق: ٣٥) واتە: بۆیان هەیە چیان بوێت تێیدا، وە لاشمانە زیاد لەوە. زۆرێك لەزانایان تەفسیری (مزید) یان بەوە کردووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ تەفسیری

(زیادە) ی پێ کردووە، ئەویش ڕوانینە بۆ چهرەی خودا. شێخ ئەفەرموێ: وە ئەم بابە لە کتێبەکەی خودای باڵادا زۆرە. ئەوەی لە قورئان رابمێنێت بەمەبەستی هیدایەت وەرگرتن لێیەوە، ڕێگەی هەقی بۆ ڕوون دەبێتەوە.

## ئیسپاتی سیفات بۆ خودا لە سوننەتدا

**پ ٣٥: ئایا سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەلالەت دەکات لەسەر ئیسپاتی سیفات بۆ خودا؟ حوکمی ئیمان و باوەڕپێبوونیان چیە؟**

و ٣٥: شێخ الإسلام فەرموویەتی: پاشان لە سوننەتی پێغەمبەری خودادا ﷺ ڕێی هەقی بۆ ڕوون دەبێتەوە، چوون سوننەت تەفسیری قورئان دەکات و ڕوونی دەکاتەوە و دەلالەتی لەسەر دەکات و گوزارشت و تەعبیری لێدەکات.

وە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفی خواوەندی خۆی پێکردووە لەفەرمودەگەلێکی دروستی ئەوتۆدا کە ئەهلی مەعریفەو زانست قەبوڵیان کردوون، بەهەمان شێوە ئیمان و باوەڕپێبوونیان (واجب)ە.

**پ ٣٦: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی (نزول) و دابەزینی خودای باڵا بۆ ئاسمانی دنیا لەسەر ئەوەی شایەنی کەماڵ و شکۆی ئەو بێت؟**

و ٣٦: بەڵگە فەرمایشتی پێغەمبەرمانەﷺ: (ينزل ربنا إلى السماء الدنيا كل ليلة حين يبقى ثلث الليل الآخر، فيقول من يدعوني فأستجيب له؟ من يسألني فأعطيه؟ من يستغفرني فأغفر له؟) متفق عليه. واتە: پەروەردگارمان هەموو شەوێك کاتێك سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێ دادەبەزێ بۆ ئاسمانی دونیا، جا دەفەرموێ کێ بانگم لێدەکات وەڵامی بدەمەوە؟ کێ داوای بەخشینم لێدەکات پێی ببەخشم؟ کێ داوای لێبوردنم لێدەکات لێی ببورم؟

**پ ٣٧: بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی کە خودا شادمان دەبێت بە تەوبەی بەندەکەی و پێدەکەنێت علی مایلیق بە تعالی؟**

و ٣٧: بەڵگە فەرمایشتی پێغەمبەرمانە ﷺ: (لله أشد فرحا بتوبة عبده المؤمن التائب من أحدكم براحلته. . .) متفق علیه.[1]

واتە: خودا شادمانترە بەتەوبەی بەندەی باوەڕداری تۆبەکاری خۆی لەیەکێك لە ئێوە کە ولاّخەکەی دەدۆزێتەوە بە خواردن و ئاوەکەیەوە، وە فەرمایشتی: (یضحك الله إلى رجلین یقتل أحدهما الآخر، کلاهما یدخل الجنة) متفق علیه. واتە: خودا بە دوو پیاو پێدەکەنیّ یەکێکیان ئەوی دیکە دەکوژێت، هەردووکیان دەچنە بەهەشتەوە. پێغەمبەری خودا ئیسپاتی شادمانی و پێکەنینی بۆ کردووە بەو شێوەیەی شیاوی کەماڵ و شکۆی خودا بێت.

**پ ٣٨: بەڵگە چیە لەسەر ئەوەی کە خودا سەیری پێدێت لە نائومێدبوونی بەندەکانی و پێدەکەنێت علی مایلیق بە تعالی؟ بەڵگەی لەسەر بهێنە.**

و ٣٨: بەڵگە فەرمایشتی خواوەندمانە: (عجب ربنا من قنوط عبادە و قرب غیرە، ینظر إلیکم أزلین قنطین فیظل یضحك یعلم أن فرجکم قریب).[2] حدیث حسن. واتە: پەروەردگارمان سەیری دێت لە نائومێد بوونی بەندەکانی لەگەڵ نزیکی گۆڕینی حاڵیان لە سەغڵەتی یەوە بۆ فراوانی و گوشادی، تەماشاتان دەکات سەغڵەتن نائومێدن، جا هەر

---

(١) رواه مسلم ٤/٣٠٩٩، رقم ٢٦٧٥.

(٢) د. خالد نوسیویەتی: هیچ کەسێکم نەبینیوە بەم سیاقە ریوایەتی کردبیّ. . . وە بە لەفزێکی دیکە زۆرێك لە ئەهلی حەدیس ریوایەتی کردووە، وە وتویەتی: (وضعفه شعیب الأرناؤوط). رواه الطیالسي في مسنده ١/١٤٧، رقم ١٠٩٢. خوێنەری بەڕێز، مەبەست بە سیفەتی (عجب) و (ضحك) لەسەر فەرزی دروستێتی فەرمودەکە لەجۆری هاوشێوەی سیفەتی مرۆڤەکان نیە، بەڵکو هیچ کەسێك هاوشێوەی خودا نیە لەزات و سیفات و کردارەکانیدا. وەرگێڕ.

پێدەکەنێ (چوون) دەزانێ کە دەرووڵێکرانەوەتان نزیکە. واتە: نەمانی سەغڵەتیەکەتان نزیکە.

**پ ٣٩: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی سیفەتی پێ بۆ خودای بالا لەسەر ئەوەی شایەنی بێت؟**

و ٣٩: بەڵگە فەرمایشتی پێغەمبەرمانە ﷺ: (لا تزال جهنم يلقى فيها و هي تقول هل من مزيد؟حتى يضع رب العزة فيها رجله) واتە: بەردەوام خەڵك فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخ، وە ئەویش دەڵێت: هی دیکە هەیە؟ هەتا خواوەندی بالادەست پێی دەخاتەناویەوە، وە لە ڕیوایەتێکدا: (عليها قدمه فينزوي بعضها إلى بعض فتقول قط قط) متفق عليه. واتە: پێی لەسەری دادەنێ، جا دێتەوە یەك ئەڵێت بەسمە بەسمە. یانی کەسم ناوێ.

**پ ٤٠: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی (بانگ کردن) و دەنگ و کەلام بۆ خودای بالا على مايليق به تعالى؟ بەڵگەگەلێك بهێنە ئیسپاتی ئەوە بکات.**

و ٤٠: بەڵگە فەرمایشتی پێەمبەرمانە ﷺ: (يقول تعالى يا آدم فيقول لبيك و سعديك فينادي بصوت إن الله يأمرك أن تخرج من ذريتك بعثا إلى النار) متفق عليه. واتە: خودا دەفەرموێ: هۆ ئادەم، جا ئەویش دەڵێت: لبيك وسعديك، جا خودا بە دەنگێکی بەرز بانگ ئەکات بێگومان خوا فەرمانت پێدەدات کە لە نەوەکانت کۆمەڵێك لە ئاگر دەربکە.

وە فەرمایشتی: (ما منكم من أحد إلا سيكلمه ربه وليس بينه و بينه ترجمان) متفق عليه.[1]

واتە: هیچ کەسێك نیە لە ئێوە ئیللا پەروەردگاری قسەی لەگەڵدا دەکات، وە هیچ وەرگێڕێکیش لەنێوان خواو بەندەکەیدا نیە.

(١) رواه البخاري رقم ٧٠٠٥ و احمد في المسند رقم ١٨٢٧٢.

**پ ٤١: بەڵگە چیە لەسەر بڵندی خودا و (استواء)ی لەسەر عەرشی خۆی علی مایلیق بە تعالی؟**

**و ٤١: بەڵگە فەرمایشتی پێغەمبەرمانە ﷺ لە (رقیه) و نزا بۆ کردنی نەخۆش: (ربنا الله الذي في السماء تقدس اسمك، أمرك في السماء و الأرض كما رحمتك في السماء، اجعل رحمتك في الأرض، اغفر لنا حوبنا و خطايانا، أنت رب الطيبين أنزل رحمة من رحمتك و شفاء من شفائك على هذا الوجع فيبرأ) حديث حسن رواه أبوداود و غيره.** [١]

**واتە: پەروەردگارمان ئەی ئەو خودایەی لە ژووروووە، ناوی تۆ پاك و پیرۆزە، فەرمانی تۆ لە ئاسمان و زەویدایە، وەك ئەوەش رەحمەت و بەزەییت لە ئاسماندایە، رەحمەت و بەزەییت دابەزێنە بۆ زەوی، ئەی خوایا، گوناهەکان و هەڵەکانمان بپۆشە، تۆ پەروەردگاری پاکانی رەحمەتێك لە رەحمەتی خۆت و شیفایەك لە شیفای خۆت دابەزێنە بۆسەر ئەم ئازارە هەتا نەمێنێت. وە فەرمایشتی: (ألا تأمنوني و أنا أمين من في السماء) حديث صحيح. واتە: ئایا ئێوە من بە ئەمین نازانن، من ئەمینی ئەو زاتەم لەسەرووە. . . وە فەرمایشتی: (والعرش فوق الماء والله فوق العرش، و هو يعلم ما أنتم عليه) حديث حسن رواه أبوداود و غيره.[٢]، واتە: عەرش لەسەر ئاوە و خوداش لەسەر عەرشە و ئەزانێ ئێوە لەسەر چ حاڵێکدان. وە فەرمایشتی بۆ کەنیزەکەکە: (أين الله؟ قالت في السماء، قال: من أنا؟ قالت أنت رسول الله، قال: اعتقها فإنها مؤمنة) رواه مسلم. واتە: خودا لە کوێیە؟ وتی: لەسەرووە، فەرمووی: من کێم؟ وتی: تۆ نێردراوی خوایت، فەرمووی: ئازادی بکە چونکە ئیمانداره. وە لە فەرمودەیەکی دیکەدا کە هەریەك لە بوخاری و مسلم ریوایەتیان کردووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ**

---

(١)رواه أبوداود رقم ٣٨٩٢ و أحمد رقم ٢٤٠٠٣ و ضعفه الألباني و الأرناؤوط.

(٢)قال الدكتور خالد: رواه ابن خزيمة في التوحيد ١/٢٤٤، رقم: ١٥٠.

فەرموویەتی: (إن الله كتب كتابا.... فهو عنده فوق العرش) واتە: خودا کتێبێکی نووسیوە، ئەویش لەلای خۆیەتی لەسەر عەرش.

**پ ٤٢: بەڵگە چیە لەسەر مەعییەتی خودا؟ بەبەڵگە بیسەلمێنە کە دژایەتی نیە لەگەڵ (علو) و بڵندی خودا لەسەر عەرشی خۆی.**

و ٤٢: بەڵگە فەرمایشتی پێغەمبەرمانە ﷺ: (أفضل الإيمان أن تعلم أن الله معك حيثما كنت) حديث حسن[١] واتە: باشترین ئیمان ئەوەیە کەبزانیت لە هەرکوێ بیت خودات لەگەڵە.

وەفەرمایشتی: (إذا قام أحدكم إلى الصلاة فلا يبصقن قبل وجهه ولا عن يمينه، فإن الله قبل وجهه، ولكن عن يساره أو تحت قدمه) متفق عليه.[٢] واتە: کاتێك یەکێکتان هەستا بۆ نوێژ با تف هەڵ نەدا بۆ بەردەمی خۆی و لای ڕاستی، چونکە خودا لەرووی وی یە، با هەڵیبدا بۆ لای چەپی. یاخود بیکاتە ژێرپێی.

وەفەرمایشتی: (اللهم رب السموات السبع و الأرض ورب العرش العظيم، ربنا ورب كل شيئ، فالق الحب والنوى، منزل التوراة والإنجيل والقرآن، أعوذبك من شر نفسي و من شر كل دابة أنت آخذ بناصيتها، أنت الأول فليس قبلك شيئ، وأنت الآخر فليس بعدك شيئ، وأنت الظاهر فليس فوقك شيئ، وأنت الباطن فليس دونك شيئ، اقض عني الدين وأغنني من الفقر) رواه ملسم. واتە: ئەی خودایە خاوەنی حەوت ئاسمانەکەو زەوی و خاوەنی تەختی گەورە، ئەی خواوەندی ئێمە و هەمووشتێك، پشکوێنەری دانەوێڵەو ناوکە، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنات پێدەگرم لە خراپەی نەفسم و لە خراپەی هەموو رەوەندەیەك تۆ پێشەسەریت گرتووە،

(١) د. خالد نوسیویەتی: رواه الطبراني في المعجمم الاوسط رقم ٨٧٩٦ و ضعفه الألباني في ضعيف الجامع ١/٢٩٣. بەلآم ماناکەی دروستە.

(٢) د. خالد دەڵێت: رواه مسلم رقم ٣٠٠٨ و احمد رقم ٥٣٣٥.

تۆ سەرەتایت هیچ شتێك لە پێش تۆوە نیە، وە تۆ دواینی هیچ شتێك لە دوای تۆوە نیە، وە تۆ دیار و ئاشکرای بەسەرەوە هیچ شتێك لە ژووروی تۆوە نیە، وە تۆ نادیار و پەنهانیت هیچ شتێك لەخوار تۆوە نیە، قەرزەکەم جێبەجێ بکە و بێنیازم بکە لە هەژاری.

فەرمایشتی: (اللهم رب السموات. . . . . الخ) ئیسپاتی ناوەکانی خودا لە خۆ دەگرێت. وە فەرمایشتی ﷺ کاتێك یاوەران بە زیکر و یادی خودا دەنگیان بەرزکردەوە: (أيها الناس أربعوا على أنفسكم فإنكم لاتدعون أصما ولا غائبا، إنما تدعون سميعا بصيرا إن الذي تدعونه أقرب إلى أحدكم من عنق راحلته) متفق عليه.[1] واتە: ئەی خەڵکینە لەسەر خۆتان بن، بێگومان ئێوە بانگ لە کەڕێك و غاییبێك ناکەن، بەڵکو بانگ لە بیسەرێکی بینای نزیك ئەکەن، بێگومان ئەوەی ئێوە بانگی دەکەن نزیکترە لە یەکێکتانەوە لە ملی وڵاخەکەی.

**پ ٤٣: بەڵگە چیە لەسەر ئیسپاتی بینینی ئیمانداران بۆ خودا لە ڕۆژی قیامەتدا؟**

و ٤٣: بەڵگە فەرمایشتی پێغەمبەرمانە ﷺ: (إنكم سترون ربكم كما ترون القمر ليلة البدر لا تضامون في رؤيته، فإن استطعتم أن لا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس و صلاة قبل غروبها فافعلوا) متفق عليه. واتە: بێگومان لە ڕۆژی قیامەت خواوەندتان دەبینن وەك ئەوەی مانگی چواردە دەبینن بە ئاشکراو روون، جا ئەگەر توانیتان دوو نوێژ لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدەن نوێژێك بەر لە هەڵاتنی خۆر و نوێژێکیش بەر لە ئاوابوونی ئەوە وابکەن.

واتە: ئەگەر توانیتان نوێژی بەیانی و نوێژی عەصر لەکاتی خۆیاندا بکەن دوایان مەخەن.

---

(١) د. خالد نوسیویەتی: رواه البخاري رقم ٦٠٢١ و احمد رقم ١٩٦١٤، و النسائي في الكبرى رقم ٧٦٨٠.

هاوشێوەی ئەم فەرموودەگەلەی پێغەمبەری خودا ﷺ تێیاندا هەواڵ لە خواوەندی خۆی ئەدا بەوەی هەواڵی پێدەدرێت، فەرموودەگەلێکی دیکە بخوێنەوە لە کتێبەکانی فەرموودەدا.

**پ ٤٤: هەڵوێستی ئەهلی سوننەت لەم ئایەتگەل و فەرموودەگەلەی سیفاتی خودایان تێدا جێگیر بووە چیە؟**

و ٤٤: شیخ الإسلام فەرمویەتی: بێگومان کۆمەڵی ڕزگاربوو ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕدەهێنن بەوە (واتە: بەوەی پێغەمبەری خودا هەواڵی لێداوە) وەك ئەوە باوەڕیش دێنن بەوەی خودا هەواڵی پێداوە لە کتێبەکەیدا بەبێ (تەحریف) و (تعطیل) و (تکییف) و (تمثیل).

**پ ٤٥: پێگەو مەکانەتی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چیە لە نێوان گروپەکانی ئوممەتی ئیسلامیدا؟ ڕوونی بکەرەوە.**

و ٤٥: شیخ الإسلام فەرموویەتی: بەڵکو ئەوان نێوەندگیرن لەنێو گروپەکانی ئوممەتدا، وەك ئەوەی کە ئوممەتیش نێوەندگیرە لەنێو ئوممەتاندا. ئەوان نێوەندگیرن لەبابی سیفاتی خودادا –سبحانە و تعالی- لەنێوان ئەهلی تەعطیل (جهمیة) و ئەهلی تەمسیل (مشبهە)دا.[1]

وە هەم نێوەندگیرن لەبابی کردارەکانی خودا لەنێوان(جبرية) و (قەدەریە) و گروپەکانی دیکەدا.[2]

---

(١) ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەبابی سیفاتدا نێوەندگیرن لەنێوانیاندا، چونکە جەهمیە نەفی سیفاتی خوا دەکات و (مشبهة) ئیسپاتی سیفاتی خوا و زێدەڕەوی لە ئیسپاتکردنیاندا دەکات هەتا خوا لە سیفاتیدا دەچوێنن بە دروستکراوەکانیەوە. ئەمما ئەهلی سوننەت ئیسپاتیان کردوون لەسەر ئەو شێوەی شایەنی کەماڵ و شکۆی خودابن.

(٢) جەبریە زێدەڕەویان کردووە لە ئیسپاتی قەدەردا، وە پێیان وایە بەندە توانای هیچ کردارێکی نیە، بەڵکو لە چەشنی درەختێکە با بەلای راست و چەپدا بیشەکێنێت. وە(قەدەریە) بە پێچەوانەی (جەبریە)وە پێیان وایە بەندە کرداری خۆی خەلق دەکات بەبێ ئیرادە و ویستی خودا، وە ئەهلی سوننەت لەنێوان ئەو دووگروپەدا دەڵێن بەندە خاوەنی ئیرادە و ویستی خۆیەتی، وە بەئیرادە و ویستی خۆی کردار ئەنجام ئەدا، بەلاّم خوا دروستکاری خۆی و کردارەکانیەتی، وە ئیرادە و ویستی بەندە تابعی ئیرادە و ویستی خوایە وەك ئەوەی خوا سبحانە فەرمویەتی: (لمن شاء منكم أن يستقيم وماتشا ؤن الا أن يشاء الله رب العالمين).

وه لەبابی وەعید (واتە: هەڕەشەی خودا بە سزا.) نێوەند گیرن لەنێوان (مرجئة) و (وەعیدیە) لە قەدەریە و گروپەکانی دیکەدا.(١)

وه لەبابی ناوەکانی ئیمان و دین نێوەند گیرن لەنێوان حەرورییە و موعتەزیلە و لەنێوان مورجئە و جەهمیەدا.(٢)

وه لەبابی یاوەرانی پێغەمبەری خوداشدا ﷺ نێوەند گیرن لەنێوان ڕافیزە و خەواریجدا.(٣)

---

(١) مرجئەدەڵێن: هیچ سەرپێچیەك لەگەڵ ئیماندا زیان ناگەیەنێت، وە پێیان وایە کە مرۆڤی سەرپێچیکار ناچێتە دۆزەخ، وە (وەعیدیە) لە قەدەریە و هاوشێوەکانیان دەڵێن: دز و درۆزن و زیناکار و هاوشێوەکانیان لەسەر پێچیکاران ئەگەر تەوبە نەکەن ئەوە بە هەمیشەیی لە ئاگردا ئەبن. ئەهلی سوننەت دەڵێن: تاوان و سەرپێچی ئیمانیان کەم دەکات، وە خاوەنەکانیشیان لە ژێر ویستی خوادا دەبن، جا ئەگەر خوا بیەوێ سزای تاوانکارو سەرپێچیکار دەدات، بەڵام بۆ هەمیشە و هەتا هەتایە لە ئاگردا نابێت، وە ئەگەر بیشیەوێت لێی خۆش دەبێ ئەگەر بەر لەمردن تەوبەشی نەکردبێ.

(٢) (حەروریە) و (موعتەزیلە) ئەڵێن: ئیمان و دین قسە و کردەوە و ئیعتقادە، بەڵام نەزیاد ئەکات و نە کەم ئەکات، جائەوەی گوناهێکی گەورەی ئەنجام دابوو وەك زینا و گوناهی لەو شێوەیە، ئەوە لەسەر مەزهەبی حەروریە کافر بووە، وە لەسەر مەزهەبی موعتەزیلە (فاسق) بووە و بۆ هەمیشە و هەتا هەتایە لە ئاگردا دەبێ، وە دەڵێن: ئەو کەسە لە دونیادا نە ئیماندارە و نە کافرە، بەڵکو ئەڵێن: لە مەنزیلەیەکدایە لەنێوان کوفر و ئیماندا، وە ئەویش (فسق)ە، واتە: فاسق بوونە. وە گروپی مورجئە ئەوانەی دەڵێن: ئیمان تەنها قسەیە، یاخود باوەڕکردنە بە دڵ، پێیان وایە سەرپێچی ئیمان کەم ناکات و خاوەنەکەشی شایستەی دۆزەخ نابێت ئەگەر حەڵاڵی نەکات، وە جەهمیە وەك مورجئەیە، چونکە ئەڵێن: ئیمان تەنها مەعریفەیە، جا ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: ئیمان قسەوکردەوە و ئیعتقادە، بە گوێڕایەڵی (طاعة) زیاد دەکات و بەسەرپێچی (معصیة) کەم دەکات، وە دەڵێن: بێگومان سەرپێچیکار لە ئەهلی تەوحید (کافر) نیە تەنها لەبەر سەرپێچیەکە. وە بۆ هەمیشە و هەتا هەتایە لە ئاگردا نابێت بە پێچەوانەی قسەی خەواریج و موعتەزیلەوە. وە دیسان دەڵێن: سەرپێچیکردن ئیمان کەم ئەکات و خاوەنەکەشی شایستەی ئاگر ئەبێت مەگەر خودا بە فەزڵ و چاکەی خۆی لێی خۆش بێت. بەپێچەوانەی راوبۆچونی جەهمیە و مورجئەوە.

(٣) ڕافیزە زێدەڕەویان لە (علی) و ئالی بەیتدا کردووە، وە هەم تەکفیری یاوەرانیان کردووە ئیللا چەند کەسێکیان نەبێ، وە خەواریجیش تەکفیری زۆرێك لە یاوەرانیان کردووە و تەفسیقی هەندێکی دیکەشیان کردووە، بەڵام ئەهلی سوننەت پێچەوانەی هەموویان کردووە، وە هەموو ئالی بەیت و یاوەرانیان خۆشویستوون و زێدەرەویشیان لە هیچ یەکێکیاندا نەکردووە.

## بڵندیەتی (علو) ی خودا بەسەر دروسکراوەکانیەوە

**پ ٤٦: ئەگەر کەسێك وتی: ئەهلی سوننەت و جەماعەت قسەی دژبەیەك دەکەن لەئیسپاتی سیفاتی خودادا و دەڵێن: خودا لەسەرووی دروستکراوەکانیەوەیە لە ژوورووی ئاسمانەکانیەوە، وە لەهەمانکاتیشدا ئیسپاتی ئەوەی بۆ دەکەن لەگەڵ دروستکراوەکانی بێت، جا وەڵامی ئەوە چۆنە؟ مەگەر ئەوە دژبەیەکی نیە لەعەقیدەیاندا؟**

و ٤٦: نەخێر، بەڵکو شیخ الإسلام فەرموویەتی: هەڵبەت باوەڕبوون بەوەی خودا لەکتێبەکەیدا هەواڵی لێداوە و بە (تەواتور) و فرەگێڕەرەوە لە پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ پێمان گەیشتووە و سەلەفی ئوممەتیش ئیجماعی لەسەر کردووە ئەوەیەکە خودا (سبحانە) لەسەرووی ئاسمانەکانەوەیە لەسەر عەرشی خۆی و بڵندە بەسەر خەڵقی خۆیەوە و لەگەڵیشیاندایە لەهەر کوێیەك بن، دەزانێ چی دەکەن, چونکە جەمعی کردووە لە نێوانیان لە فەرمایشتی خۆیدا: (هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) (سورة الحدید: ٤). راڤەمان کردووە. بڕوانە: وەڵامی پرسیاری (٣١). وەرگێڕ.

وە شێخ فەرموویەتی: باوەڕبوون بەوەی خودا هەواڵی لێداوە لە کتێبەکەیدا و. . هتد، داخڵ بووە لەوەدا باسمان کرد لەباوەڕبوون بە خودا.

وە فەرموویەتی: وە مانای فەرمایشتی: (وهو معکم) ئەوە نیە کە خودا تێکەڵ بە خەڵك بوبێت، جابێگومان زمانی عەرەبی ئەم مانایە هەڵناگرێت، وە ئەوە پێچەوانەی ئیجماع و کۆدەنگی سەلەفی ئوممەت و پێچەوانەی ئەوەیە خودا خەڵکی لەسەر دروست کردووە، بەڵکو مانگ نیشانەیەکە لە نیشانەکانی خودا و لە بچوکترینی دروستکراوەکانی و لە

هەمانکاتدا دانراوە لە ئاسماندا و لە هەمانکاتیشدا لەگەڵ ڕێبوار و غەیری ڕێبواریشدایە لە هەرکوێیەك بێت. وە خودا (سبحانه) لەسەرووی عەرشەوە چاودێرە بەسەر خەڵك و مرۆڤەوە، زاڵ و ئاگادارە بەسەریانەوە. . بەجگەلەوە لە واتاکانی (ربوبیەت) و خواوەندێتی خۆی.

وە ئەم هەموو فەرمایشتەی خودا باسی کردووە - لەوەی لە ژوورعەرشە و لەگەڵماندایە — هەقە لەسەر هەقیقەتەکەی[(١)] پێویست بە (تحریف) و گۆڕین ناکات، بەڵام ئەپارێزرێ لەگومانگەلی درۆینە وەك ئەوەی گومان ببرێت کە (ظاهر) و رووکەشی فەرمایشتی: (في السماء) واتای ئەوەیە ئاسمان خودا هەڵبگرێت یاخود لەکن بگرێت، وە ئەو گومانە (باطل) و پووچە بە ئیجماعی ئەهلی عیلم و ئیمان، چوون بێگومان زانستی خودا ئاسمانەکان و زەوی داگرتووە: (وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ) (سورة البقرة: ٢٥٥)، بێگومان خودا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیردەکات بۆ ئەوەی لە جێگاکانیان نەترازێن: (إن الله يمسك السموات و الأرض أن تزولا) (فاطر: ٤١). (و يمسك السماء أن تقع على الأرض إلا بأذنه) واتە: وە ئاسمان ڕاگیردەکات کە بکەوێ بەسەر زەوی دا ئیللا بە ویستی خۆی نەبێ. (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ) (سورة الروم: ٢٥) واتە: وە لەنیشانەکانی خودا ئەوەیەکە ئاسمان و زەوی بەفەرمانی ئەو ڕادەوەستن.

---

(١) شیخ ڕەحمەتی خوای لێبێت بۆ ئەوە مانگی بە نمونە هێناوەتەوە هەتا مانای سیفەتی مەعییەت و ئیسپاتکردنی بۆ خودا نزیك بکاتەوە لەفام و زیهنی مرۆڤ، بەلاّم بیرمان نەچێت هەندێك لەسەلەف دەفەرموون مەبەست بە مەعییەتی خودا بۆ مرۆڤ و خەڵك لەگەڵ بوونی خودایە بۆیان بە زانست، وە من ئەم وتەیەم بەلاوە گونجاوترە.

## باوەڕبوون بە نزیكی خودا لە خەڵكی خۆی لەگەڵ باوەڕبوون بە (علو) و بڵندیەتی

**پ ٤٧: ئایا باوەڕبوون بە نزیكی خودا لەبەندەكانیەوە دژایەتی نیە لەگەڵ (علو) و بڵندیەتی بەسەر دروستكراوەكانیەوە؟**

و ٤٧: نەخێر. . . شیخ الإسلام فەرموویەتی: . . . باوەڕبوون بەوەی كە خودا نزیكەو وەلاّمی نزای بەندەكانی دەداتەوە داخڵی باوەڕبوون بە خودا بووە. بێگومان قورئانی شكۆدار و سوننەتی پێغەمبەری سەردار ﷺ جەمعیان كردووە لەنێوان نزیكی خودا بەبەندەكانی و (علو) و بڵندیەتی بەسەر دروستكراوەكانیەوە و هیچ دژبەیەكیەك نیە لەنێوان نزیكی خودا و بەندەكانی و (علو) و بڵندیەتی بەسەریانەوە بەبەڵگەی فەرمایشتی: (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ اجیب دعوة الداع اذا دعان) (سورة البقرة: ١٨٦) واتە: وە كاتێك بەندەكانم پرسیاری منیان لێت كرد ئەوە من نزیكم وەلاّمی داوای داواكار دەدەمەوە كاتێك داوای لێكردم.

وە فەرمایشتی پێغەمبەرەكەی: (إن الذي تدعونه أقرب إلى أحدكم من عنق راحلته).[١] ، وەئەوەی باسكراوە لە قورئان و سوننەتدا لەنزیكی و مەعییەتی خودا دژبەیەك نیە لەگەڵ ئەوەی باس كراوە لە (علو) و بڵندییەتی دا چوون خودا – سبحانه – هیچ شتێك هاوشێوەی نیە لە (نعوت) و سیفاتیدا، وە ئەو بڵندە لە نزیكی دا و نزیكە لە بڵندێتی دا (و هو علي في دنوه قريب في علوه).

---

(١) واتا و تەخریجمان كردووە. وەرگێڕ.

## ئیسپاتی (کەلام) بۆ خودای بالاّ

**پ ٤٨: راستی باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە قورئان و کەلامی خوداوەندا چیە؟ وە چی دەڵێیت دەربارەی ئەوەی باوەڕی وایە عبارەتە یاخود حیکایەتە لە کەلامی خوداوەند؟**

و ٤٨: باوەڕبوون بەوەی قورئان کەلامی خودایە، دابەزێنراوە, مەخلوق نیە، لە خواوە دەستییپێکردووە و بۆ لای ئەویش دەگەڕێتەوە، لە باوەڕ بوونە بە خوداو کتێبەکانی، وە بێگومان خودا فەرمایشتی پێکردووە بەڕاستی و حەقیقەت، وە هەر ئەم قورئانەی خودا دابیەزاندووە بۆ سەر (محمد) درودی خوای لەسەر بێت کەلام و فەرمایشتی خودایە نەك هی غەیری وی، وە دروست نیە بگوترێ حیکایەتە یان عیبارەتە لە کەلام و فەرمایشتی خودا، بەڵکو کاتێك خەڵك دەیخوێنێتەوە یاخود دەینووسێتەوە لە (مصاحف) و کۆپەڕەکاندا، بەوە دەرناچێت لەوەی کە کەلام و فەرمایشتی خودابێت بەراستی و حەقیقەت، چوون (کەلام) بە حەقیقەت نیسبەت بەوە دەدرێت لەسەرەتاوە گۆی پێکردووە نەك ئەوەی تەبلیغی لێوە کردووە و گەیاندویەتی، وە ئەو قورئانە کەلام و فەرمایشتی خودایە پیتەکانی و ماناکانی، نەك پیتەکان کەلام و فەرمایشتی خودابن بەبێ ماناکان و نەك ماناکانیش کەلام و فەرمایشتی وی بن بە بێ پیتەکان.

## بینینی باوەڕداران بۆ خواوەندیان لە ئاخیرەتدا

**پ ٤٩: ئایا باوەڕبوون بە بینینی خودا بۆ باوەڕداران لەڕۆژی قیامەتدا داخڵ بە باوەڕبوون بە خودا و کتێبەکانی و فریشتەکانی و نێردراوەکانی دەبێت؟**

و ٤٩: بەڵێ، شیخ الإسلام فەرموویەتی: باوەڕبوون بەوەی ئیمانداران خواوەندیان بە چاوی سەریان دەبینن وەك ئەوەی خۆر دەبینن لە ڕۆژێکی سامالّدا کە ئاسمان هیچ پەڵە هەورێکی پێوە نەبێت، وە وەك ئەوەی مانگی

چوارده دەبینن کە هیچ شتێك بەر لەبینینی نەگرێت[1] ، خودا -سبحانە- دەبینن لە کاتێکدا ئەوان لە عەرەصات و گۆڕەپانی قیامەتدان، پاشان لە دوای چوونە نێو بەهەشتیشەوە دەیبینن هەرچۆن خودا خۆی بیهەوێت. وە ئەوەش هەمووی داخڵ بە باوەڕبوون بە خودا و کتێبەکانی و فریشتەکانی و نێردراوەکانی دەبێت.[2]

## ئەوەی دەبێت و دەگوزەرێت لە بەرزەخدا

**پ ٥٠: باوەڕ بەوەی لە گۆڕدا دەگوزەرێت داخڵ بە چ بابێك دەبێت؟**

و ٥٠: داخڵ بەبابی باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی دەبێت، شیخ الإسلام فەرموویەتی: باوەڕبوون بە هەموو ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵی لێداوە لەوەی لە دوای مردن لە گۆڕدا دەگوزەرێت لەباوەڕبوونە بە ڕۆژی دوایی. ئەهلی سوننەت و جەماعەت بڕوا دەهێنن بە تاقیکردنەوە و سزا و خۆشی گۆڕ، جا تاقیکردنەوەکە ئەوەیە کە خەڵك لە گۆڕەکانیاندا تاقی دەکرێنەوە، بە پیاو دەگوترێ: خواوەندت کێ یە؟ و ئایینت چیە؟ و پێغەمبەرت کێ یە؟جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە خودا دامەزراویان دەکات بە گوفتارێکی چەسپاو لە ژیانی دونیا و ئاخیرەتدا، ئیماندار دەڵێت: خواوەندم (الله) یە و ئیسلام ئایینمە و (محمد) درودی خوای لەسەربێت پێغەمبەرمە.

وە دوودڵ (مرتاب) یش دەڵێت: هاە هاە نازانم، گوێم لێبوو خەڵك شتێکیان دەوت منیش دەموت، جا بە چەکوشێکی ئاسن پیادەکێشرێت، یەك هاوار دەکات هەمووشتێك (گیانلەبەرێك) گوێی لێدەبێت مرۆڤ نەبێت، وە ئەگەر مرۆڤ گوێی لێببێت ئەوا (لەترساندا) دەمرێت، پاشان لەدوای ئەم فیتنەو تاقیکردنەوەیە یان خۆشگوزەرانی (نعیم) ە یاخود سزاو

(١) مەبەست لەوە چواندنی بینینە بە بینینەوە نەك چواندنی خۆر و مانگ بە خوداوە. وەرگێڕ.

(٢) لام وایە ئەگەر بینوسیبایە داخڵ بە باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی دەبێت دروستتر بوو. وەرگێڕ.

ئازارە هەتا قیامەتی گەورە هەڵدەستێت، جا ئەوکات گیانەکان دەگێڕدرێنەوە بۆ لاشەکان.

**پ ٥١: ئایا ڕۆژی قیامەت و زیندووکردنەوە خودا و پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵیان لێداوە و موسڵمانانیش ئیجماع و کۆدەنگیان لەسەری کردووە.**

و ٥١: بەڵێ، شیخ الإسلام فەرموویەتی: وە قیامەت ئەوەی خودا هەواڵی لێداوە لە کتێبەکەیدا و لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیدا هەڵدەستێت و موسڵمانانیش ئیجماع و کۆدەنگیان لەسەری کردووە، جا خەڵك (بە فەرمانی خودا) لە گۆڕەکانیان بە پێخاوسی و ڕووت و قوتی و خەتەنە نەکراوی هەڵدەستنەسەرپێ لە بۆ خواوەندی جیهانەکان.

**پ ٥٢: حاڵی خەڵکی لە گۆڕەپان و (عەرەصات) ی قیامەت لەدوای زیندووکردنەوەیان چۆن دەبێ؟ ڕوونی بکەرەوە.**

و ٥٢: شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . خۆر لێیان نزیك دەبێتەوە و عەرەق دەگاتە لای دەمیان، ترازووەکانیش دادەنرێن بۆ کێشانەکردنی کردەوەکانی بەندەکان، جا کردەوەکانیانی پێ کێشانە دەکرێت وەك ئەوەی خودا فەرموویەتی: (فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ) (سورة المؤمنون: ١٠٢-١٠٣) واتە: جا ئەوەی ترازووەکانی کردەوەکانی قورس بوو، ئەوە ئەوانەن ڕزگاربووان، وە ئەوەی ترازووەکانی کردەوەکانی سووك بوو، ئەوە ئەوانەن خۆیان لەکیس داوە، وە لە دۆزەخدان هەتا هەتایە.

وە دیوانەکان بلاْو دەکرێنەوە، وە ئەوانیش کارنامەکانی بەندەکانن، جا هەیە کارنامەکەی بە دەستی ڕاستی وەردەگرێت، وە هەیە بەدەستی چەپی وەری دەگرێت یاخود لە پشتیەوە، وەك ئەوەی خودای پاك و بالاْ فەرموویەتی: (وَكُلَّ إِنْسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنْشُورًا اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا) (سورة

الإسراء: ١٣-١٤) واتە: وە کردەوەی هەموو مرۆڤێکمان لە ملی کردووە، وە لەڕۆژی قیامەتدا کارنامەیەکی بۆ دەردەهێنین، بە کراوەیی پێی دەگات، (پێی دەڵێین:) کارنامەکەت بخوێنەرەوە، هەر بەتەنها خۆت بەسیت لە خۆت بپرسیتەوە.

**پ ٥٣: چۆن خودا لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەندەکانی دەپرسێتەوە؟ڕوونی بکەرەوە.**

و ٥٣: شیخ الإسلام فەرموویەتی: . . . . خودا لێپرسینەوە لەگەڵ هەموو خەڵك دەکات، بەندەی ئیماندار تاك دەکاتەوە و لێی دەپرسێتەوە، ئەویش دان بە گوناهەکانیدا دەنێت وەك ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا وەصفی ئەوەی کردووە، وە ئەمما بەنیسبەتی کافرانەوە ئەوە لێیان ناپرسێتەوە بە لێپرسینەوەی کەسێك چاکەکانی و خراپەکانی کێشانە دەکرێن، چوون هیچ چاکەیان نیە[١]، بەڵکو کردەوەکانیان هەژماردەکرێ، جا ئامار دەکرێ، جا لەسەریان ڕادەگیرێن و دانیان پێدادەنێن، وپێشیان سزادەدرێن.

**پ ٥٤: حەوزەکەی پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی قیامەتدا لەکوێ دەبێت؟ و سیفەتی چۆن چۆنیە؟**

و ٥٤: حەوزەکەی لە گۆڕەپانی قیامەتدا دەبێ وەك ئەوەی شیخ الإسلام فەرموویەتی: وە (وفي عرصة القيامة الحوض المورود للنبي)، پاشان فەرمویەتی: ئاوەکەی لە شیر سپی ترە و لە هەنگوین شیرین ترە، کوپەکانی بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان دەبن، درێژی حەوزەکە مانگە ڕێیەکە و پانیەکەشی مانگە ڕێیەکە، ئەوەی یەك جار ئاوی لێ بخواتەوە، هەرگیز دوای ئەوە تینووی نابێت.

---

(١) ئەمە وتەیەکە لەدوو وتەکەی ئەهلی عیلم، وە وتەکەی دیکەیان ئەوەیە کە کردەوەکانیان کێشانە دەکرێ بەبەڵگەی فەرمایشتی: (ومن خفت موازينه. . .) (المؤمنون: ١٠٣).

**پ ٥٥: ( صراط ) چیە و لەکوێ دەبێت؟ و چۆنە؟**

و ٥٥: (صراط) پردێکە لەسەر پشتی دۆزەخ دەبێت وەك ئەوەی شیخ الإسلام فەرمویەتی: .... وە (صراط) لەسەر پشتی دۆزەخ دانراوە، ئەویش پردێکە لە نێوان بەهەشت و ئاگردا، خەڵکی بەسەریدا تێدەپەڕێت بەئەندازەی کردەوەکانیان، جا هەیە وەك چاوتروکان تێدەپەڕێت، وە هەیە وەك بروسکە تێدەپەڕێت، وە هەیە وەك با تێدەپەڕێت، وە هەیە وەك ئەسپی تیژڕەو تێدە پەڕێت، وە هەیە وەك سواری حوشتر تێدەپەڕێت، وە هەیە بەڕاکردن ڕادەکات، وە هەیە بە ڕۆشتن دەڕوات، وە هەیە بە زەحف و لەسەر سك دەڕوات، وە هەیە بەفڕاندن دەفڕێندرێ و هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە، چوون ئەو پردە قولاپگەلێکی لەسەرە خەڵکی بە کردەوەکانیان دەفڕێنن.

**پ ٥٦: زانایان ئەوەیان چەسپاندووە چەندین پردی دیکە هەیە لە پێش بەهەشتەوە، لە کوێن و سوودەکەیان چییە؟؟**

و ٥٦: شیخ الإسلام فەرموویەتی: ... ئەوەی بەسەر (صراط) دا تێپەڕی کرد، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، جا کاتێك بەسەر (صراط) دا تێپەڕیان کرد، ئەوە لەسەر پردێك لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا رادەگیرێن، جا تۆڵە لە هەندێکیان بۆ هەندێکیان وەردەگیرێ، جا کاتێك پاك و خاوێن بوونەوە ڕێگەی چوونە بەهەشتیان پێدەدرێ.

**پ ٥٧: یەکەم کەسێك کێیە داوای کردنەوەی دەرگای بەهەشت دەکات؟ وە یەکەم ئوممەت کێیە دەچێتە بەهەشتەوە؟**

و ٥٧: شیخ الإسلام فەرموویەتی: . . . وە یەکەم کەس داوای کردنەوەی دەرگای بەهەشت دەکات پێغەمبەری خودایە (محمد) ﷺ، وە یەکەم ئوممەتیش لە ئوممەتەکاندا دەچێتە بەهەشتەوە ئوممەتەکەی ئەوە.

**پ ٥٨: ئەو شەفاعەتگەلەی تايبەتە بە پێغەمبەرمان ( محمد ) ﷺ چین و کامانەن؟**

**و ٥٨: شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . وە پێغەمبەری خودا ﷺ لەرۆژی قیامەتدا سێ شەفاعەتی بۆ هەیە:**

**شەفاعەتی یەکەم: شەفاعەت دەکات بۆ ئەهلی مەوقف هەتا خودا داوەری بکات لە نێوانیاندا لە پاش ئەوەی پێغەمبەرەکان ئادەم و نوح و ئیبراهیم و موسی و عیسای کوڕی مەریەم لێی پاشگەزدەبنەوە هەتا ئەگاتە سەر پێغەمبەری خودا (ﷺ).**

**شەفاعەتی دووەم: شەفاعەت بۆ ئەهلی بەهەشت دەکات بڕۆنە بەهەشتەوە، وە ئەم دوو شەفاعەتە تايبەتە بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ).**

**شەفاعەتی سێیەم: شەفاعەت دەکات بۆ ئەوانەی شایستەی ئاگرن، وە ئەم بەشەیان بۆ پێغەمبەر و پێغەمبەرانی دیکە و صدیقەکان و کەسانێکی دیکەشە، جا پێغەمبەر ﷺ شەفاعەت دەکات بۆ ئەوەی شایستەی چوونەناو ئاگر بێت بۆ ئەوەی نەچێتە ناویەوە، وە شەفاعەتیش دەکات بۆ ئەوەی چووەتە ناو ئاگرەوە بۆ ئەوەی لێی دەرچێت.(١)**

**پ ٥٩: ئەو بەشەی شەفاعەت کامەیە پێغەمبەرمان ( محمد ) درودی خوای لەسەر بێت لەگەڵ پێغەمبەرانی دیکە و صدیقەکان تێیدا بەشداران؟**

**و ٥٩: بەشی سێیەمە. واتە: ئەوەی لە وەڵامی پرسیاری (٥٨) دا شێخ باسی کردووە.**

**پ ٦٠: ئایا هیچ کەسێك بەبێ شەفاعەت لە ئاگر دەردەچێت و قورتار دەبێت؟**

**و ٦٠: بەڵێ، شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . . وە خودا بۆ خۆی خەڵکانێك بەبێ شەفاعەت بەڵکو بە فەزڵ و چاکە و ڕەحمەت و بە زەیی**

---

(١) شیخ دوو جۆر شەفاعەتی باس کردووە کە تايبەتە بە پێغەمبەری خوداوە، ئەمما جۆری سێیەمی باس نەکردووە، ئەویش شەفاعەتکردنیەتی بۆ سووککردنی سزا لە مامی خۆی أبو طالیب.

خۆی لە ئاگر دەردەهێنێت، وە لەبەهەشتدا جێگەیەکی زیادە بە چۆڵی دەمێنێتەوە لەوەی چووەتە ناو بەهەشتەوە لە ئەهلی دونیا، جا خودا خەڵکانێك بۆ ئەو جێگە زیادەیە دروست دەکات، دەم و دەست داخڵی بەهەشتیان دەکات. واتە: بەهەشتیان پێ پڕدەکاتەوە.

**پ ٦١: جۆرەکانی باوەڕەکان و درێژەیان دەربارەی ڕاستیەکانی ڕۆژی دوایی لەکوێ باسکراوە؟**

و ٦١: .... وە جۆرەکانی ئەوەی ڕۆژی قیامەت لە زیمنی دەگرێت لە حیساب و لێپرسینەوە و پاداشت و تۆڵە و بەهەشت و ئاگر و درێژەی ئەوە لە کتێبە ئاسمانیەکان و ئاسار و زانستی بە جێماو لە پێغەمبەرانەوە باسکراوە. وە لە زانستی بە میراتگیراو لە (محمد) ەوە ﷺ لە ئەوەی شافی و کافی بێت، جائەوەی بیهەوێت لەوێ دەستی دەکەوێت.

## باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە قەدەردا

**پ ٦٢: ڕاستی باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چیە لە قەدەردا؟**

و ٦٢... وە گروپی ڕزگاربوو ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕ بەقەدەر دەهێنن بە خێر و شەڕیەوە.

**پ ٦٣: شيخ الإسلام باوەڕ بە قەدەری کردووە بە دوو پلەوە، چین و کامانەن؟**

و ٦٣: شيخ الإسلام فەرمویەتی: ... وە باوەڕبوون بە قەدەر لەسەر دوو پلەیە: هەر پلەیەك دووشتی لەخۆ گرتووە:

پلەی یەکەم: باوەڕبوون بەوەی خودای باڵا زانایە بە خەڵك، وە ئەوان کردەوە بەگوێرەی زانستی قەدیم و دێرینی ئەو ئەنجام دەدەن، ئەوەی ئەو بە ئەزەل و ئەبەدیێی وەسفکراوە، وە زانستی بە هەموو ئەحواڵ و کاروباریان هەیە لە تاعات و سەرپێچیەکان و ڕزق و ڕۆزی و ئەجەل و ماوەی تەمەن پاشان ئەندازەی دروستکردن و هەموو شتێکی لە تابلۆی پارێزراو(لوح المحفوظ)دا نوسیوە.

وه ئەما پلەی دووەم: ویستی جێبەجێ بوو و توانستی هەمەگیری خودایە، ئەویش باوەڕبوونە بەوەی هەرچیەك خودا ویستویەتی بووە و ئەوەشی ئەو نەیهەوێت نابێت، وە هیچ شتێك نیە لە ئاسمانەكان و لە زەویدا لە جوڵە و سكون ئیللا بە ویستی خودایە –سبحانە- وە هەرچی ئەو نەیهەوێت لە موڵك و دەسەڵاتی خۆیدا نابێت، وە ئەو توانای بەسەر هەمووشتێكدا دەشكێت لە بوونەكان و نەبوونەكان، جا هیچ دروستكراوێك لەزەوی و لە ئاسماندا نیە ئیللا خودا دروستكاریەتی، هیچ دروستكارێك نیە غەیری ئەو نەبێ، وە جگە لەو هیچ پەروەردگارێكیش نیە، وە لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانی بە بەندەكانی كردووە بە گوێڕایەڵی خۆی و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەكەی و پێشگیریشی كردوون لەسەر پێچیكردنی خۆی و پێغەمبەرەكەیﷺ.

**پ ٦٤: بەڵگە چیە لەسەر پلەی یەكەم، واتە: پلەی دروستكردنی خودای باڵا بۆ دروستكراوەكان؟**

**و ٦٤**: یەكەم شتێك خودا دروستی كرد (قەڵەم) بوو، پێی فەرموو: بنوسە، وتی: چی بنوسم؟ فەرمووی: ئەوەی ئەبێت هەتا ڕۆژی قیامەت بینووسە.[1]

جا ئەوەی تووشی مرۆڤ دەبێت نابێت هەڵەی بكات، وە ئەوەی هەڵەی كرد (واتە: مرۆڤی هەڵە كرد) نابێت تووشی بێت[2] قەڵەمەكان بەرزكراونەتەوە و ڕووپەڕەكانیش پێچراونەتەوە وەك ئەوەی خودای باڵا فەرموویەتی: (أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ) (سورة الحج: ٧٠) واتە: ئایا نەتزانیوە كە

(١) روى الترمذي ٤/٤٥٧، رقم ٢١٥٥ بلفظ: (إن أول ما خلق الله القلم فقال: اكتب، فقال: ما أكتب؟ قال: اكتب القدر ما كان وماهو كائن إلى الأبد).

(٢) واتە: تووشی نابێت. وەرگێڕ.

خوا دەزانێ چی لە ئاسمان و زەویدایە بێگومان ئەوە لە کتێبێك (واتە: لە لوح المحفوظ) دا نوسراوە، بێگومان ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە. وە فەرموویەتی: (مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ) (سورة الحديد: ٢٢) واتە: هیچ موسیبەتێکتان توش نابێ لەزەویدا یاخود لە خۆتاندا ئیللا لە کتێبێکدا نووسراوە بەرلەوەی دروستی بکەین، بێگومان ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە.

**پ ٦٥ : ئەو ئەندازەگیرییەی ( تابع ) ی زانستی خودایە چیە؟ ئایا تێکڕایە؟ ڕوونی بکەرەوە لەگەڵ بەڵگە هێنانەوەدا.**

**و ٦٥: ئەو ئەندازەگیری یە (کتابەت)ە، واتە: نووسینە، شێخ دەربارەی فەرمویەتی: .... وە ئەم ئەندازەگیرییەی تابعی زانستی خودایە، لە هەندێك جێگەدا بە (جوملە) کورتی و (تەفصیل) درێژی یە، بێگومان خودا ئەوەی ویستویەتی لە تابلۆی پارێزراودا نووسیویەتی، وە کاتێکیش کۆرپەلە دروست دەکات بەر لە گیان بەبەرداکردنی فریشتەیەك دەنێرێت بۆلای، جا فەرمانی پێدەکات بە چوار وشە، بەنووسینی رزق و ئەجەل و کردەوەکەی و چارەنوسی کەساسە یاخود بەختەوەرە، وە وێنەی ئەوە، جا ئەم ئەندازەگیری یە زێدەڕەوەکانی قەدەریەلە کۆندا ئینکاریان دەکرد، وە ئینکاریکارانی لەمڕۆدا کەمن.**

**پ ٦٦ : دوبارەیە، وە وەڵامەکەی لە زیمنی وەڵامی پرسیاری ( ٦٥ ) دایە.**

**پ ٦٧ : ئایا خودای باڵا کێی خۆش دەوێت لە بەندەکانی و لێیان ڕازی دەبێت بە پێچەوانەشەوە. . ؟**

**و ٦٧: .... وە خودا –سبحانە- پارێزکاران و ئەهلی ئیحسان و چاکەکاری و چاکەخوازی و دادپەروەرانی خۆش دەوێت و رازی دەبێت لەوانەی باوەڕیان هیناوە و کردەوەی چاکەیان ئەنجام داوە، وە (بە**

پێچەوانەوە) کافرانی خۆش ناوێت و لە کۆمەڵی فاسیقان ڕازی نابێت[1]، وە فەرمان ناکات بە (فحشاء)[2] و بەدڕەوشتی، وە ڕازی نابێت بە کوفر بۆ بەندەکانی و خۆشی بە گەندەڵی و فەساد و خراپەکاریش نایەت.

**پ ٦٨: ئایا بەندەکان بە هەقیقەت بکەری کردارەکانیانن؟ ڕوونی بکەرەوە لەگەڵ هێنانەوەی بەڵگەدا بۆ ئەوەی دەیڵێیت.**

و ٦٨: بەڵێ، شیخ الإسلام فەرمویەتی: .... وە بەندەکان بکەر و ئەنجامدەری کردارەکانیانن بە هەقیقەت، وە خوداوەند دروستکارە بۆ کردارەکانیان، وە بەندەکان ئیماندار و کافر و چاکەکار و خراپەکار و نوێژخوێن (نوێژگەر) و ڕۆژووگر توانایان هەیە بەسەر ئەنجامدانی کردەوەکانیاندا و خاوەنی ئیرادەو ویستی خۆیانن، وە خوداوەند دروستکاری خۆیان و دروستکاری توانا و ئیرادە و ویستی بەندەکانە وەك ئەوەی فەرموویەتی: (لِمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ أَنْ يَسْتَقِيمَ وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) (سورة التكوير: ٢٨-٢٩) واتە: بۆئەوەی لە ئێوە ویستی لەسەر هەق بێت، وە ناشتوانن لەسەر هەق بن مەگەر کە خوای خاوەنی جیهانەکان بیەوێت.

**پ ٦٩: هەڵوێستی قەدەریە چی بوو لە پلەو مەرتەبەی دروستکردنی کردارەکانی بەندەکان بۆ خودای باڵا؟ وە ئەوانەی بەرامبەریان وەستانەوە و زێدەڕەویان کرد لە ئیسپاتکردنیدا کێ بوون؟**

و ٦٩: قەدەریە بەگشتی باوەڕیان بەوە نەبوو خوداوەند دروستکاری کردارەکانی بەندەکان بێ، بۆیە شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . . وە ئەم پلەو مەرتەبەیە لە قەدەر، قەدەریە ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ ناوی لێیان ناوە مەجوسی ئەم ئوممەتە تێکڕایان باوەڕیان پێی نیە. وە کۆمەڵێکیش لە

(١) ئەمە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر کوفر و فیسقەکەیان و تەوبە نەکەن. وەرگێڕ.

(٢) واتە: تاوانی گەورەو ناقۆلاً وەك زینا.

ئەهلی ئیسپات زێدەڕەوییان تێدا کردووە هەتا توانست و ئیختیاریشیان لەبەندە سەلب کردوە، وە حیکمەتەکان و بە رژەوەندیەکانیان لە کردارەکان و ئەحکامی خوداوەندیش دەرکردوە.

## پێناسەی ئیمان لەلای ئەهلی سوننەت و جەماعەت

**پ ٧٠: ڕاستی ئیمان لەلای ئەهلی سوننەت و جەماعەت چیە؟**

و ٧٠: شیخ الإسلام فەرمویەتی: ... وە بێگومان یەکێك لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە کە ئایین و ئیمان وتە و کردەوەیە، وتەی دڵ و زمان و کردەوەی دڵ و زمان و پەلەکان (جوارح).

**پ ٧١: ئایا ئیمان زیاد و کەم دەکات لەلای ئەهلی سوننەت و جەماعەت؟**

و ٧١: ... وە بێگومان ئیمان بە گوێڕایەڵی زیاد دەکات و بەسەرپێچی کەم دەکات.

**پ ٧٢: ئایا ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە ڕەهایی سەرپێچیەکان، ئەهلی قیبلە تەکفیر دەکەن؟ لەگەڵ بەڵگە هێنانەوەدا.**

و ٧٢: شیخ الإسلام فەرمویەتی: .... وە ئەوان لەگەڵ ئەوەشدا[١]، ئەهلی قیبلە بەڕەهایی سەرپێچیەکان (کبائر) تەکفیر ناکەن وەك ئەوەی (خەوارج) دەیانکرد، بەڵکو برایەتی ئیمانی لە لایان لەگەڵ سەرپێچیەکانیشدا دەمێنێت وەك ئەوەی خودا –سبحانه- فەرمویەتی: (فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ) (سورة البقرة: ١٧٨) واتە: جا ئەوەی لەلایەن براکەیەوە لە تۆڵەسەندنەوە بەخشرا، با خاوەن خوێنەکە بەشێوەیەکی باش داوای خوێنباییەکە بکات، وەبا بکوژەکەش بە چاکی خوێنەکە بدا.

وە فەرمویەتی: (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ

---

(١) واتە: لەگەڵ ئەوەی باوەڕیان وایە ئیمان زیاد و کەم دەکات.

فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ) (سورة الحجرات: ٩-١٠) واتە: وە ئەگەر دوودەستە لە ئیمانداران شەڕیان کرد، ئەوە ئیسلاحی نێوانیان بکەن، جا ئەگەر یەکێکیان دەستدرێژی کرد بۆ سەر ئەوی دیکەیان، ئەوە کوشتار لەگەڵ ئەوەیان بکەن دەستدرێژی دەکات هەتا ئەگەڕێتەوە بۆ لای فەرمانی خودا، جا ئەگەر گەڕایەوە (بۆلای فەرمانی خودا) ئەوە سوڵحی نێوانیان بکەن بە دادگەری، وە دادپەروەریش بن، بێگومان خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێ، بێگومان ئیمانداران هەر بران، جا ئیسلاحی نێوان دوو دەستە براکانتان بکەن.

**پ ٧٣: ئایا ئەهلی سوننەت و جەماعەت سەلبی ئیسلام لە فاسقی میللی بە یەکجاری دەکەن؟ یاخود گوفتار بەمانەوەی هەمیشەیی دەکەن لە ئاگردا؟ وە ئایا ئەوەی لە ئیسلام دەریدەکات و گوفتار بەمانەوەی هەمیشەیی دەکات لە ئاگردا کێیە؟**

و٧٣: شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . وە ئەهلی سوننەت و جەماعەت سەلبی ئیسلام بە گشتی و بەیەکجاری لە فاسقی میللی ناکەن و ناشڵێن بە هەمیشەیی و هەتا هەتایی لە ئاگردا دەبێت وەك ئەوەی موعتەزیلە دەڵێت، بەڵکو موسڵمانی (فاسق) داخڵی ناوی باوەڕی ڕەها دەبێت (یدخل في اسم الایمان المطلق) وەك ئەوەی لە فەرمایشتی: (وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ) (النساء: ٩٢) دا هاتووە. بێگومان وشەی (المؤمنة) فاسقیشی داخڵ دەبێ، وە کەمجاریش دەبێ کە داخڵی ناوی باوەڕی ڕەها نەبێ وەك ئەوەی هاتووە لە فەرمایشتی خودای بالادا: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا) (الأنفال: ٢) واتە: بێگومان ئیمانداران هەر ئەوانەن کاتێك یادی خودا بکرێ ترس دڵەکانیان دادەگرێت، وە کاتێکیش ئایەتەکانمان بەسەریاندا بخوێنرێتەوە ئیمانیان زیاد دەکەن. وە لە فەرمایشتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ: (لایزني الزاني حین یزني

وهو مؤمن، ولايسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن، ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن، ولا ينهب نهبة ذات شرف يرفع الناس إليه فيها أبصارهم حين ينتهبها وهو مؤمن)[1] هاتووه: زیناکار زینا ناکات له کاتێکدا زینا بکات ئیمانداری کامڵ بێت، وه (دز) یش دزی ناکات له کاتێکدا دزی بکات ئیماندای کامڵ بێت، وه شەرابخۆریش شەراب نانۆشێت له کاتێکدا بینۆشێت ئیمانداری کامڵ بێت، وه فڕێنەر هیچ شتێکی بەنرخ نافڕێنێت له کاتێکدا بیفرێنێت ئیمانداری کامڵ بێت.

وه ئەڵێین: فاسقی میللی ئیمانداری (ناقص الإيمان) ە، واته: کەم و کورتی له ئیمانەکەیدایه، یاخود ئیمانداره به ئیمانەکەی،فاسقیشه به (فسق) و گوناهه گەورەکەی، جا بەهۆی (فسق) و گوناهه گەورەکەیەوه ناوی باوەڕی ڕەهای پێنادرێ و سەلبی موتڵەقی ناوی باوەڕیشی لێناکرێ.[2]

## باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت له یاوەراندا

**پ ٧٤: ئایا باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەربارەی یاوەرانی پێغەمبەری خودا ﷺ چییه؟ لەگەڵ بەڵگه هێنانەوه بۆ ئەوەی دەیڵێیت.**

و ٧٤: شيخ الإسلام فەرمویەتی: ... وه یەکێك له بنەماکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتیه له سەلامەتی دڵ و زمانیان بۆ یاوەرانی پێغەمبەری خود ﷺوەك ئەوەی خودا وه صفی پێکردوون له فەرمایشتی خۆیدا: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ) (سورة الحشر: ١٠) واته: وه ئەوانەی لەدوای ئەوانەوه هاتوون دەڵێن

---

(١) رواه البخاري ٢/٨٧٥، رقم: ٢٣٤٣، و مسلم ١/٧٦، رقم: ٥٧.

(٢) ئیمانی موتڵەق: ئیمانی کامڵ و تەواوه، وه ئەویش ئیمانی ستایشکراوه، وه موتڵەقی ئیمانیش ئیمانی (ناقص) و کەم و کورته. . . وه ئەم ئیمانه له خوار ئیمانی کامڵەوەیه، وه له فاسقی میللی سەلب ناکرێت، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانه: (مجموعة الفتاوى ٣/١٥٢، ٧/٢٣٠، ٧/٢٤١، ٢٥٧، ١٢/١٥٩، واقتضاء الصراط المستقيم ١/٧٠).

پەروەردگارمان خۆمان و لە و برایانەشمان ببورە بە ئیمانەوە پێشمان کەوتوون، وە هیچ رقێکیش مەخەدڵمانەوە سەبارەت بەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارمان بێگومان تۆ خوایەکی بەسۆزی میهرەبانیت. وە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوایش ﷺ لە فەرمایشتی خۆیدا: (لاتسبوا أصحابي فو الذي نفسي بيده لو أن أحدهم أنفق مثل أحد ذهبأ مابلغ مد أحدكم ولا نصيفه)[1] واتە: جنێومەدەن بە یاوەرانم، سوێندبێ بەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە ئەگەر یەکێکتان هێندەی کێوی (ئوحود) زێڕ ببەخشێت ئەوە ناگات بە مشتێك یاخود نیومشتی یەکێکیاندا.

وە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەی قورئان و سوننەت و ئیجماع پێی هاتووە لە فەزڵ و گەورەیی و چاکە و پلە و پایەیان قەبوڵ دەکەن.

**پ ٧٥: ئایا ئەهلی سوننەت و جەماعەت جیاوازیان کردووە لە فەزڵ و چاکە لەنێوان یاوەراندا؟ واتە: فەزڵ و چاکەی هەندێکیان داوە بەسەر هەندێکیاندا؟**

و ٧٥: بەڵێ، وەك ئەوەی شیخ باسی کردووە و فەرمویەتی: .... وە ئەوەی لە پێش (فەتح) واتە: ڕێکەوتنی حودەیبیەداماڵی بە خشیوە و جەنگی کردووە فەزڵی دەدەن بەسەر ئەوەی دواى (فەتح) ماڵی بەخشیوە و جەنگی کردووە[2]

**پ ٧٦: ئایا ئەهلی سوننەت و جەماعەت شایەتی بەهەشت بۆ هیچ یەکێك دەدەن؟**

و ٧٦: بەڵێ، شیخ الإسلام فەرمویەتی: ... وە شایەتی بەهەشت دەدەن بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی بەهەشتی بۆ داوە وەك دە موژدە پێدراوەکە (العشرة المبشرة) و (ثابت بن قيس بن شماس) و کەسانێکی دیکە لەیاوەران.[3]

---

(١) رواه البخاري ٣/١٣٤٣، رقم: ٣٤٧٠، ومسلم ٤/١٩٦٧، رقم: ٢٥٤٠.

(٢) وە خودا بەڵێنی بەهەشتی بە هەموویان داوە وەك ئەوەی فەرموویەتی: (وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى) (سورة الحديد: ١٠). وەرگێڕ.

(٣) بێگومان یاوەران ئەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەری خودا ﷺ هێناوە و لەسەر ئەو باوەڕەشیان مردوون هەموویان دەچنە بەهەشتەوە، بەکوێرایی چاوی ڕافیزە و هاوشێوەکانیان. وەرگێڕ.

**پ ٧٧: ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕیان چۆنە لە ڕیزبەندی بەرترینی یاوەران خودایان لیّ ڕازییێت لە پاش پێغەمبەری خودا ﷺ؟**

و ٧٧: شیخ الإسلام فەرموویەتی: . . . وە دان دەهێنن بەوەی بەتەواتور و فرەگێڕەرەوە لە فەرمانڕەوای ئیمانداران (علي بن ابي طالب) ەوە خودا لێی ڕازیبێت و غەیری ئەویشەوە گوازراوەتەوە فەرمویەتی: باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەرەکەی (ابوبکر) ە، پاشان (عمر)، وە (عثمان) بە سێیەم و (علي) بە چوارەم لە ڕیزبەندیدا هاتوون خودا لێیان ڕازی بێت، وە ئەویش (ئاثار) دەلالەتی لەسەر کردووە، وە وەك ئەوە یاوەرانیش کۆدەنگیان لەسەر پێشخستنی (عثمان) کردووە لە بەیعەت پێداندا، لەگەڵ ئەوەدا هەندێك لە ئەهلی سوننەت رای جیاوازیان هەبووە لە (عثمان) و (علي) دا خودا لێیان ڕازی بێت لەدوای ئیتیفاقیان لەسەر پێشخستنی (ابوبکر) و (عمر)، ئایا کام لە (عثمان) و (علی) چاکتر و لەبەرتر بوون، کۆمەڵێك (عثمان) ی پێشخستوە بەسەر (علی) دا و سکوتی کردووە، وە کۆمەڵێکیش (علي) پێشخستووە بەسەر (عثمان)دا، وە کۆمەڵێکیش تەوەقوفی کردووە (واتە: تیا وەستاوە)، بەڵام (لە کۆتاییدا) کاری ئەهلی سوننەت لەسەر پێشخستنی (عثمان) پاشان (علي) جێگیر بووە.

**پ ٧٨: ئایا لە مەسەلەی فەزڵدانی (علی) بەسەر (عثمان) دا خودا لێیان ڕازی بێت هیچ کەسێك گومڕا دەکرێت ئەگەر (علی) پێش بخات؟**

و ٧٨ - ٧٩: نەخێر، شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . . وە ئەگەر چی ئەم مەسەلەیە —مەسەلەی عثمان و علي- لەو بنەماگەلە نیە خاوەن ڕای جیاواز تێیدا گومڕا بکریّ لەلای جەماوەری ئەهلی سوننەت، بەڵام لەمەسەلەی خیلافەت و جێنشینێتی دا گومرادەکریّ، وە لەبەر ئەوە ئەهلی سوننەت باوەڕدەهێنن بەوەی کە خەلیفە لەدوای پێغەمبەری خودا ﷺ (ابوبکر) بووە، پاشان (عمر)، پاشان (عثمان)، پاشان (علي) بووە،

وە ئەوەی تانەبدات لە خیلافەتی یەکێك لەوان، ئەوە لە گوێدرێژی ماڵەکەی گومڕاترە.

## باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە ئەهلی بەیتدا

**پ ٨٠: باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە ئالی بەیت و بنەماڵەی پێغەمبەردا ﷺ چیە؟ لەگەڵ بەڵگە هێنانەوەدا.**

**و ٨٠: ... وە ئەهلی بەیت و بنەماڵەی پێغەمبەری خودایان ﷺ خۆش دەوێت و دۆستایەتیان دەکەن و وەسیەت و ڕاسپاردەی پێغەمبەری خودایان ﷺ تێدا دەپارێزن کاتێك لەڕۆژی (غەدیری خوم) دا فەرمووی: (أذكركم الله في أهل بيتي)[1] واتە: خواتان وەبیر دەهێنمەوە لە ئەهلی بەیت و بنەماڵەکەمدا، وە لە کاتێکدا عەبباسی مامیشی سکاڵاو دادی خۆی برد بۆلای بەهۆی ئەوەی هەندێك لە قورەیش بەنی هاشمیان بێزار دەکرد و هاوەڵێتیان ڕەق بوو لەگەڵیاندا، پێی فەرموو: (والذي نفسي بيده لايؤمنون حتى يحبوكم لله و لقرابتي)[2] واتە: سوێندم بێ بەوزاتەی نەفسمی بەدەستە بڕواناهێنن هەتا ئێوەیان خۆش دەوێت لەبەر خوداو لەبەر خزمایەتی من، وە فەرمووشی: (إن الله اصطفى بني اسماعيل واصطفى من بني اسماعيل كنانة واصطفى من كنانة قريشاً واصطفى من قريش بني هاشم واصطفاني من بني هاشم)[3] واتە: بێگومان خودا کوڕانی ئیسماعیلی هەڵبژارد، وە لە کوڕانی ئیسماعیلیش کینانەی هەڵبژارد، وە لە کینانەش قورەیشی هەڵبژارد، وە لە قورەیشیش کوڕانی هاشمی هەڵبژارد، وە لە کوڕانی هاشمیش منی هەڵبژارد.**

---

(١) رواه مسلم ٤/١٨٧٣، رقم ٢٤٠٨.

(٢) رواه ابن أبي شيبة في المصنف ٦/٣٨٢، رقم ٣٢٢١٣، والطبراني في الكبير ١١/٤٣٣، رقم ١٢٢٢٨.

(٣) رواه مسلم ٤/١٧٨٢، رقم ٢٢٧٦، و الترمذي ٥/٥٨٣، رقم: ٣٦٠٥.

**پ ٨١: باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چیە لە هاوسەرەكانی پێغەمبەردا (ﷺ)؟لەگەڵ بەڵگە هێنانەوەدا.**

و ٨١: شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . وە هاوسەرەكانی پێغەمبەری خودا ﷺدایكانی ئیماندارانیان خۆش دەوێت و باوەڕدەهێنن بەوەی هاوسەرگەلی پێغەمبەری خودا دەبن لە ئاخیرەتدا بە تایبەت (خەدیجە) خودا لێی ڕازی بێت دایكی زۆرترینی منالەكانی و یەكەم ژنێك باوەڕی پێ هێناوە و هاوكاری كردووە لەسەر ئایینەكەی، وە مەنزیلەت و پێگەیەكی بەرز و بڵندیشی هەبوو لەلای پێغەمبەرﷺ، وە (صديقة)ی كچی (صديق)یش خوداليێ ڕازی بێت، ئەو ژنەی پێغەمبەر ﷺتێیدا فەرموویەتی: (فضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام)[1] واتە: فەزڵی عائیشە بەسەر ژناندا وەك فەزڵی تریت (نان و گۆشت) وایە بەسەر خواردەمەنیەكانی دیكەدا.

**پ ٨٢: هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چیە لە ڕێگە و ڕێبازی ڕافیزەكان و ناصیبەكان؟**

و ٨٢: شیخ الإسلام فەرموویەتی: ... وە بەرائەت دەكەن لە ڕێگەو ڕێبازی ڕافیزەكان ئەوانەی یاوەران دەبوغزێنن، و جنێویان پێدەدەن، وە بەرائەتیش دەكەن لە ڕێگەو ڕێبازی ناصیبەكان ئەوانەی ئازاری ئەهلی بەیت دەدەن بەقسە و وتار یاخود بەكردە و كردار، وە زمانی خۆیشیان دەگرنەوە لەوەی ڕووی داوە لە نێوان یاوەراندا لەشەڕ و ئاشووب.

**پ ٨٣: هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چیە لەو (ئاپار) و گێڕدراوانەی لە (مساوئ) و خراپەی هەندێك لە یاوەراندا گوازراونەتەوە؟**

و ٨٣: شیخ الإسلام فەرمویەتی: ... وە دەڵێین: بێگومان ئەم (ئاثار) و گێڕدراوانەی لە (مساوئ)و خەراپەیاندا گوازراوەتەوە، تێیاندا هەیە درۆیە،

(١) رواه البخاري ٣/١٢٥٢، رقم: ٣٢٣٠، و مسلم ٤/١٨٨٦، رقم: ٢٤٣١.

وه تێیاندا هەیە بۆی زیادکراوە و لێی کەم کراوە و ڕووە ڕاستەکەی گۆڕدراوە، وە ئەوەی ڕاست و دروست بێ ئەوان بەهانەیان بووە تێیدا، یان (مجتهد) بوون و ڕاستیان پێکاوە، وە یان (مجتهد) بوون و هەڵەیان کردووە.

وە ئەوان (واتە: ئەهلی سوننەت و جەماعەت) لەگەڵ ئەوەدا وانازانن کە هەموو یەکێك لەیاوەران پارێزراوبێت لە گوناهی گەورە و گچکە، بەڵکو ئەوانیش گوناهیان کردووە، بەلاّم هێندە سابقە و فەزڵ و چاکەیان هەبووە مەگەر هەر خودا خۆی بزانێ بۆیە چاکەکانیان دەبێتە هۆی لێخۆشبوونی ئەوەی لێیانەوە رووی داوە ئەگەر رووی دابێ، تەنانەت خودا لە هەندێك گوناهی ئەوان دەبورێت لەوەی لەدوای ئەوانی نابورێت، لەبەر ئەوەی ئەوان چاکەگەلێکی ئەوتۆیان هەبووە هەموو گوناهێکیان دەسڕێتەوە، وە ئەوە بۆ ئەوانەی دوای ئەوان نیە.

وە هەر بەراستی بە فەرمایشتی پێغەمبەری خودا ﷺ چەسپاوە کە باشترینی ئەهلی سەدەکان بوون، وە شتێکی یەکێکیان کاتێك بەخشیویەتی لەڕێگەی خودادا چاکتربووە لە هێندەی کێوی (ئوحود) زێڕ، لەوەی لەدوای ئەوانەوە هاتووە، پاشان ئەگەر کەسێك لەوان گوناهێکی ئەنجام دابێت، ئەوە هەرزوو تەوبەی لێکردووە یاخود چاکەگەلێکی زۆری ئەنجام داوە، هەرچی کردووە سڕیویەتیەوە یاخود خودا لێی خۆش بووە بە فەزڵی سابقە و پێشکەوتنی لەباوەڕهێنان و موسڵمانبووندا، یاخود لێی خۆش دەبێ بەهۆی شەفاعەتی (محمد) ەوە درودی خوای لەسەر بێت ئەوەی ئەوان لەهەموو خەڵك شایەنترن بە شەفاعەتی ئەو، یاخود لەدونیادا تووشی بەلاّیەك هاتووە، بەوە گوناهەکەی سڕیوەتەوە. جا ئەگەر ئەمە لە گوناهێکدابێت بەکردار و بەڕاستی ئەنجامیان دابێت، ئەی ئەبێ ئەو شتانەی ئیجتهادیان تێیاندا کردووە چۆن بێ؟ ئەگەر پێکابێتیان ئەوە دوو

پاداشتیان هەیە، وە ئەگەر هەڵەشیان کردبێ ئەوە هەر پاداشتێکیان هەیە، وە هەڵەکەش بووراوە.

پاشان بێگومان ئەو ئەندازەیەی ئینکاری دەکرێ لەکرداری هەندێکیان کەمێکی کەمی نادیارە، لەپاڵ چاکەکان و باشەکانی ئەو کۆمەڵەدا لەباوەڕبوون بە خودا و پێغەمبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی خودا و کۆچ و نوسرەت و سەرخستنی ئایین و زانستی سوودبەخش و کردەوەی چاك، وە ئەوەی سەیری سیرە و ژیاننامەی ئەو کۆمەڵەی کردبێ بە زانست و بە صیرەتەوە، وە بەوەی خوا منەتی بەسەردا کردوون لە فەزائیل و چاکەکانیان ئەوە بە یەقین و دڵنیاییەوە دەزانێ کە باشترینی خەڵك لەدوای پێغەمبەران علیهم السلام ئەوان بوون.

نە لەوەو بەر وێنەیان بووە و نە لەمەو دوایش وێنەیان دەبێت، وە ئەوان صەفوەو هەڵبژێردراوی چاخەکانی ئەم ئوممەتە بوون، ئەوەی باشترینی ئوممەتان و بەڕێزترینی سەرجەم ئوممەتەکانی سەرڕووی زەوی یە لەلای خودا.

## باوەڕ و ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە کەراماتی ئەولیادا

**پ ٨٥: باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چیە لەکەراماتی ئەولیادا؟**

و ٨٥: شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . وە یەکێك لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت باوەڕکردنە بە کەراماتی ئەولیا و ئەوەی خودا ئیجرای ئەکات لەسەر دەستیان لە خەواریقی عادات [١] لە جۆرەکانی زانستەکان و موکاشەفات و جۆرەکانی توانست و کارتێکردن و ئەوەی لە ئوممەتانی پێشووەوە گوازراوەتەوە لە سورەتی (کهف)دا و لە غەیری ئەوانیش لە ئەوەڵی ئەم ئوممەتە وە گوازراوەتەوە لە یاوەران و شوێنکەوتوانیان و تێکڕای

---

(١) (خوارق) کۆی (خارق) و (عادات) یش کۆی (عادە) یە، وە مەبەست لەوە ئەو شتانەیە لەسەر خیلافی عادەتی کەونی لەسەر دەستیان ڕوودەدات بە ئیزن و ویستی خودا.

ئوممەتدا، وە ئەوە لەم ئوممەتەدا هەیە. مەبەستی شێخ رەحمەتی خوای لێبێت ئەوەیە کە کەشف و کەرامات هەتا ڕۆژی قیامەت دەوام دەکات لەم ئوممەتەدا.

**پ ٨٦: ڕێگەو ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەمەڕ دەقگەلی شەرعی و یاوەران و پێشینی چاك چییە؟**

و ٨٦: شیخ الإسلام فەرمویەتی: . . . پاشان لەڕێگەو ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت پەیڕەویکردنی ئاساری پێغەمبەری خودا ﷺ تێکڕا و پەیڕەویکردنی ڕێگەی پێشکەوتوانی یەکەمین لە کۆچبەرەکان و پشتیوانەکان و پەیڕەویکردنی وەسیەتی پێغەمبەری خودایە ﷺ وەك ئەوەی فەرمانی پێمان کردووە و فەرموویەتی: (علیکم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدین المهدیین من بعدي، تمسکوابها وعضوا علیها بالنواجذ، و ایاکم و محدثات الأمور فإن کل بدعة ضلالة)[1] واتە: پابەندی ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفەکانی راشدینی ڕێنماییکراوبن لەدوای من، دەستی پێوەبگرن، وە بەدانەکانتان قەپی پیابکەن، وە ئاگادارتان ئەکەم لە داهێنراوەکان لە ئاییندا، چونکە هەموو داهێنراوێك لە ئاییندا گومڕاییە، وە ئەوان ئەزانن کە ڕاسترینی قسە فەرمایشتی خودایە و باشترینی ڕێباز ڕێبازی (محمد) ە درودی خوای لەسەر بێت، وە فەرمایشتی خودا باو ئەدەن بەسەر قسەی هەموو جۆرە خەڵکێکدا، وە ڕێبای (محمد) یش درودی خوای لەسەر بێت پێش دەخەن بەسەر ڕێبازی هەموو کەسێدا.

**پ ٨٧: بۆ چی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەم ناوە ناونراوە؟**

و ٨٧: وە لەبەر ئەمە (واتە: لەبەر باودانی فەرمایشتی خوا بەسەر قسەی هەموو جۆرە خەڵکێکدا و پێش خستنی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەریش بەسەر سوننەت و ڕێبازی هەموو کەسێکدا) بەوە ناونراوە،

(١) رواه أحمد في المسند ٤/١٢٦، رقم: ١٧١٤٨، وأبو داود في سننه ٢/٦١٠، رقم: ٤٦٠٧.

وه ناونراوه (أهل الجماعة)، چوون (جەماعەت) کۆبونەوه (اجتماع) ە، وه دژەکەشی (فرقة) و پەرتەوازەیی یه، ئەگەر چی لەفزی (جەماعەت) بووه به ناو بۆ خودی ئەو کۆمەڵە کۆمەڵبووه، وه (اجماع) یش، ئەوەی له زانست و له ئاییندا پشتی پێدەسترێت بنەمای سێیەمە[1] ، وه ئەوان (واته: ئەهلی سوننەت و جەماعەت) هەموو وتەو وتارێك و کردە و کردارێك تێکڕا ئەوەی خەڵکی لەسەرە بەم سێ بنەمایە کێشانە دەکەن لەوەی پەیوەندی بە ئایینەوە هەبێت.

وه ئەو (ئیجماع) و کۆدەنگیەی زەبت دەبێت ئەوەیە پێشینی چاك (سەلەفی صالح) لەسەری بوون، چوون دوای ئەوان ڕاجیایی و ئیختلاف زۆر بوو، وه بڵاو بوویەوه لەناو ئوممەتدا.

**پ ٨٨: هەڵوێستی ئەهلی سوننەت و جەماعەت چیە لە فەرمانکردن بە چاکە (معروف) و پێشگیریکردن لە خراپە (منکر) و بەرپاکردنی حەج و جیهاد و نوێژی (جومعە) و دووجەژنەکە و ئەخلاقی جوان؟ لەگەڵ بەڵگە هێنانەوەدا.**

و ٨٨: شیخ الإسلام فەرموویەتی: . . . . پاشان ئەوان (واته: ئەهلی سوننەت و جەماعەت) لەگەڵ ئەو سێ بنەمایەدا فەرمان دەکەن بە چاکە و هەرشتێك شەرع فەرمانی پێکردبێ و پێشگیریش دەکەن لە خراپە و هەرشتێك شەرع جڵەوگیری لێ کردبێ لەسەر ئەوەی شەریعەت داخوازی دەکات، وه بەرپاکردنی حەج و جیهاد و (جومعە)[2] و نوێژی دووجەژنەکە لەگەڵ فەرمانڕەوایانی موسڵماندا چاك بن یاخود نا بە پێویست دەبینن.

---

(١) واته: بنەمای سێیەمە لەدوای (کتاب) و (سنة) ەوه، چوون بنەمای یەکەم (کتاب) ە و بنەمای دووەم (سنە) یە، جا بنەمای یەکەم و دووەم دووبنەمای زاتین، وه (ئیجماع) یش بنەمایەکە لەسەر جگەلەخۆی دامەزراوه، کەواتە ئیجماع نیە ئیللا بە (کتاب) یاخود (سنە) نەبێ.

(٢) وشەی (جومعە) لەزیادەی وەرگێڕە چونکە لە هەندێك لە کتێبەکانی عەقیدەی ئەهلی سوننەتدا هاتووه.

وە پارێزگاریش لە (کۆمەڵی موسڵمانان)[1] و نوێژی بە کۆمەڵ دەکەن و نەسیحەتکردنیش بەدینداری دەزانن، وە واتای فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ): (المؤمن للمؤمن کالبنیان یشد بعضه بعضا) ئیماندار بۆ ئیماندار وەك دیواری ساختمانێکە هەندێکی هەندێکی توند و تۆڵ بکات، وە پێغەمبەر ﷺ پەنجەکانی تێکهەڵکێش کرد، وە فەرمایشتی: (مثل المؤمنین في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم کمثل الجسد اذا اشتکی منه عضو تداعی له سائر الجسد بالسهر والحمی) لە ئیعتقاد و باوەڕ دەزانن، وە فەرمان دەکەن بە صەبرو ئارامگرتن لەکاتی بەلاَ و تاقیکردنەوەدا، وە بە سوپاسگوزاری لەکاتی خۆشی و زۆری ناز و نیعمەتدا، وە (فەرمان دەکەن) بە ڕازیبوون بە تاڵی قەزا و قەدەر، وە بانگی خەڵك دەکەن بۆ ئەخلاقی چاك و کردەوەی جوان و پەسەند، وە بەهەمان شێوە واتای فەرمایشتی: (أکمل المؤمنین ایمانا أحسنهم خلقا) کامڵترینی ئیمانداران لەڕووی ئیمانەوە جوانترینیانن لە ڕەوشتدا، لە ئیعتقاد و باوەڕ دەزانن، وە بانگهێشتت دەکەن بۆ ئەوەی پەیوەندی خزمایەتیت بەردەوام بێت لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵت پچڕیوە، وە ببەخشیت بەوەی بەشبڕاوی کردوویت، وە چاوپۆشی بکەیت لەوەی ستەمی لێکردوویت، وەفەرمان دەکەن بە چاکەکردن لەگەڵ باوك و دایك و سیلە و پەیوەندی خزمایەتی و دراوسێیەتی چاك و ئیحسان لەگەڵ هەتیوان و هەژاران و خەڵکی سڤیل و ڕێبوار و سۆز لەگەڵ بەندە، وە جڵەوگیری دەکەن لەفەخرو شانازی و خۆبەزلزانین و سەرکەشی و دوژمنایەتی و دەستدرێژی بۆ سەر خەڵك بەحەق یاخود بە ناحەق، وەفەرمان دەکەن بە ئەخلاقی بەرز و جڵەوگیری دەکەن لە ئەخلاقی نزم، وە هەموو ئەوەی ئەیڵێن و ئەنجامی دەدەن لەمە و لە غەیری ئەمە، ئەوە ئەوان تێیدا پەیڕەوی لەکیتاب و سوننەت دەکەن، وە

[1] کۆمەڵی موسڵمانان لە زیادەی وەرگێڕە.

ڕێگەشیان ئایینی ئیسلامە ئەوەی خودا (محمد)ی پێناردووە، بەلاّم کاتێك هەواڵی ئەوەی داوە کە ئوممەتەکەی دەبێت بە حەفتا و سێ گرووپەوە هەمووشیان لە ئاگردان تەنها یەکێکیان نەبێ، وە ئەویش (جماعە) یە، وە لە جەماعەشدا فەرموویەتی: (هم من کان علی مثل ما أنا علیه الیوم و أصحابي) ئەوانیش ئەوانەن لەسەر هاوشێوەی ئەو ڕێبازەن ئەمڕۆکە من و یارانمی لەسەرە، ئەوا ئەو جەماعەیە ئەوانە دەرچون دەستیان گرتووە بەئیسلامەوە بە پاك و پوخت لە تێکەڵکردنی بیدعەو داهێنراو لەئایینداا، وە (بەتەعبیرێکی دیکە) ئەوانەی بە پوخت و پاکی دەستیان بە ئیسلامەوە گرتووە ئەهلی سوننەت و جەماعەیە، وە صدیقەکان و شەهیدان و صالحان لەواندان، وە ئەعلامی هیدایەت (زانایانی ڕەبانی) و چراکانی تاریکیەکان و خاوەنانی سەروەریەکان و جوامێریەکان لەواندان، وە (ئەبدال) و (أولیاء) یش لەواندان، وە پێشەوایانی ئایین ئەوانەی موسڵمانان ئیجماعیان لەسەر هیدایەت و برایەتی وزانستیان کردووە لەواندان، وە (طائفة) ی (منصورە) ئەوانەی پێغەمبەری خودا تێیاندا فەرموویەتی: (لاتزال طائفة من أمتي علی الحق منصورة لایضرهم من خالفهم ولا من خذلهم حتی تقوم الساعة) ئەوانن. واتە: ئەوانەی دەربارەیان فەرموویەتی: بەردەوام دەستەیەك لە ئوممەتەکەم لەسەر هەق یارمەتیدراو دەبن، ئەوەی موخالەفەیان دەکات و پشتیان بەر دەدات زیانیان پێناگەیەنێت هەتا قیامەت هەڵدەستێت. واتە: هەتا نزیك بوونەوەی قیامەت ، داوا لەخودا دەکەین بمانگێڕێت لەوان و دڵەکانمان لانەدات دوای ئەوەی هیدایەتی داوین، وەداوای لێدەکەین کەلەلایەن خۆیەوە ڕەحمەتێکمان پێ ببەخشێت، بێگومان ئەو بەخشەرە، والله أعلم وصلی الله علی محمد و آله و صحبه و سلم تسلیما کثیرا.

